پرۆژەی ١٠٠ کتێبی کوردی

٥٩

# دیوانی مەولەوی



## سەید عەبدولرەحیمی مەعدووم

لە لایەن مامۆستا محەمەد ئەمین ئەردەلانی ەوە

کراوە بە سۆرانی



پێداچوونەوەی بە دەستکارییەوە:

گۆران عەباس

# دیوانی مەولەوی

سەید عبدولڕەحیمی مەعدوومی

لەلایەن محەمەد ئەمینی ئەردەڵانییەوە
لەهەورامییەوە گۆڕاوە بۆ زاراوەی سۆرانی

پێداچوونەوە بەدەستکارییەوە
گۆران عەباس

بەرگی یەکەم و دووەم
چاپی یەکەم
٢٠٠٨

سەید عەبدولڕەحیمی مەعدوومی
دیوانی مەولەوی. / لە هەورامی بو سورانی: محەمەد ئەمینی ئەردەلانی /
پیداچوونەوە: گوران عەباس
تهران: احسان، ١٣٨٧.
٥٩٥ ص.
فیپا.
کردی.
١ـ دیوان شعر -- شعر و ادبیات کردی
٧س BP ١٠٢/٨٨٥ ٢٩٧/١٥٠
کتابخانه ملی ایران ١٠۶٠٥١

## دیوانی مەولەوی


● شاعیر: سەید عەبدولڕەحیمی مەعدوومی
● لە هەورامییەوە بۆ سورانی: محەمەد ئەمینی ئەردەڵانی
● پیداچوونەوە: گوران عەباس
● بڵاوکار: نەشری ئیحسان
● تیراژ: ٣٠٠٠ دانە
● چاپی: یەکەم ـ ٢٠٠٩
● چاپخانە: مەهارەت




## پێشکەشە بە:

گیانە بێ گەردەکەی، ،مەولەوی، ، ی نەمرو نەوەو نەوەزاکانی.

گیانە بێ خەوشەکەی ، ،شۆڕش، ،ی جوانە مەرگی بەهیواو بەئاکام نەگەیشتوو.

ئەو باوك و دایکەم کە ئاواتیان بەستبوو بەمنەوە.

گیانە خاوێنەکەی مامۆستا شێخ عبدالعزیزی پارەزانی.

ئەوانەی لە پێناوی خواو گەل و میللەتدا گیانی خۆیانیان کرد بە قوربانی.

محەمەد ئەمین حەبیب سەعید

ئەردەلانی

# ووتەیەك

هەروەك خوێنەری بەڕێز ئاگادارە جیهانی شیعرو ئەدەب و نوسین دنیایەکی پڕ لە ناسکی و جوانیە بەڵام دوریش نیە لە ئاڵۆزی و زبری وەکو ووتراوە چەکێکی دوو سەرە خاوەنەکەی دەتوانێت لە نێو باخچەی گوڵو گوڵزاری دڵڕفێندا بیخاتە گەڕو هەستەکان بەرەو ئاسمانی خۆشەویستی بەرێت دەیشتوانێت بیکاتە چلۆسکێکی ئاگرو دڵە ناسکەکانی پێ بسوتێنێت، هەرچەندە باوکی خۆشەویستم دیوانی شیعریی تایبەت بە خۆی نەبو بەڵام شاعیرێکی نەناسراوی هەست ناسکو خامە ڕەنگین بوو حەزی بە ئەدەبیاتو نوسین بوو زۆربەی کاتەکانی بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کردبو زۆربەی هاوڕێکانیشی هەر لەو دنیایەدا دەژیان و کاتێك بەیەك دەگەیشتن ئاڵو وگۆڕی ساتە ناسکەکانی دنیای شیعرو ئەدەبیات دەکرد .... لەوانەیە خوێنەری بەڕێز بپرسێت داخۆ مامۆستا محمد ئەمین بۆچی ئەوەندە لە ڕۆحی مەولەوییەوە نزیك بوە و حەزی کردووە هەمیشە لەگەڵ هۆنراوە کانییا بژی؟ پرسیارێکی دروستە دوو هۆکار ڕۆڵیان هەبووە لەوەی باوکم زیاتر مەولەوی شاعیر بناسێت و بەو شێوەیە ئاوێزانی ئەو جیهانە ڕۆحانی و ناسکە بێت یەکەمیان هاندانی یە کێك لە هاوڕێ خۆشەویستەکانی ئەویش جەنابی مامۆستا شێخ عبدالعزیز پارەزانی بوو (خ ل) کە بەڕاستی هاوڕێیەتی برایەتیەکی پاکو بێگەرد و هەڵقوڵاو بە برایەتی ئیسلامی هەردوکیانی پێکەوە کۆکردبۆوە بۆیە ڕۆژێ مامۆستا بە باوکم دەڵێت .. مامۆستا مادامەکی بە ڕێزتان توانایەکی باشتان هەیە لەشێوە زاراوەی هەورامی و زمانی فارسیدا زۆر حەز دەکەم ئەو دیوانەی مەولەوی شاعیر وەر بگێڕیتە سەر شێوە زاراوەی سۆرانی و لێکدانەوە بۆ چامەکانی بکەیت ، باو کیشم بێ نواندنی هیچ دوو دڵییەك گوێڕرایەڵی نیشان داو دەستی پێکرد هۆکاری دووەم بەرچاو بونی ڕۆحیەتی ئیسلامی و دونیای سۆفیگەری و پاك بونەوە بۆ خوا و ژیان بۆ ڕێبازەکەی بە ئاشکرا بە هۆنراوەکانیەوە دیارە ، باوکیشم وەك سروشتی ئاسایی خۆی و مامۆستایەکی ئایینی و دەرچوی نێو ئامێزی حوجرە و مزگەوتەکانی کوردستان و دنیای پاکیزەیی ئیسلامەتی وای لە باوکم کردشان بداتە بەر ئەم کارە گران و پڕ لە هەورازە،

هەرچەندە بەندە کە ڕۆڵەو نەوەی ئەو پیاوەم بەڵام هیچ زانیاریەکم نیە دەربارەی شیعر بەڵام بە سیفەتی تێکەڵیم لەگەڵیدا و کوڕی بچوکی بوم دورو نزیك منیشی تێکەڵ بەو دنیایە کردبوو زۆر جاریش بە شداری دەکردم لە نوسینەوەی شیعرەکاندا بۆیە ئاگام لەزۆرێك لە و موعانات و بەربەست و ناڕەحەتیانە هەبو کە باوکی خۆشەویستم لەم کارەیدا ڕوبەڕوی دەبوەوە، خۆ ئەگەر بمەوێت ووردتر باس لەو ئەندێشەو ئازارو شەو نخونیانە بکەم کە باوکی خۆشەویستم دوچاری بووە ئەوا لە میانەی چوند دێڕێکی کەمدانا‌توانم دەریان ببڕم بەڵام گرنگ ئەوەیە هەرکەسێك بیەوێت ئامانجێك بۆ ژیانی دیاری بکات دەبێت بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە کارو لێبڕان و پلانی خۆی بۆ ئامادە بکات ماندو بون

نەناسێت، دیارە باوکی بەڕێزم بە تەواوی مانا ماندو نارەحەت بو لەم کارەی بێ ئەوەی چاوەڕوانی هیچ جۆرە پاداشت و پیا هەڵدانێك بێت ئەو ئامانجەی کە خۆی دایڕشتبو بە ئەنجامی گەیانی دیارە من نامەوێت بچمە نێو ووردەکاریە کانی ئەم کارەی باوکم چونکە وەك لەسەرەتاوە ووتم من هیچ شارەزاییە کم نیە لەو بووارەیاو ناتوانم خامە بخەمە سەرکاغەز بۆی بەڵام ئەم چەند دێرە تەرخان دەکەم بۆ ئەوەی چەن نزایەکی بە کوڵ بۆ باوکم بکەم و سوپاس و پێزانین بۆ ئەو کەسانە دەربڕم کە هاوکاری و کۆمەکی باوکمیان کردووە لەم کارەدا گلەیش ئاراستەی چەند هاوڕێیەکی خۆی بکەم کە لە دوای مردنی نەهاتن بەدەم داواکاریەکەمەوە بۆ پیاداچونەوەو هەڵەچنی و هەرکارێکی تری ئەم بەرهەمە کە باوکم نەیتوانی بەهۆی نە خۆشی و پاشانیش مەرگەوە تەواوی بکات.

خوایە گیان تۆ زاتێکی باڵادەست و میهرەبان و جوانکاری ئەم بونەوەرەیت هەرخۆت لەهەمو کەس باشتر زانایت بە دڵەکان (ویعلم خائنة لاعین و ماتخفي الصدور).. کەواتە پەروەردگارم بەسۆزو میهرەبانی خۆت لەگەڵ باوکی باوەڕدارمدا کە هەمیشەو بەتایبەت لە کاتی نەخۆشیەکەیدا ئەم پارچە هۆنراوەیەی دەوتو دەوتەوە بێ بێزاربون لێی (گەر مەیلەن مەیلەن وەل جەوروەن جەوروەن دڵەکەی تۆ دۆنەن ئەویشبەو تەوروەن) دەیزانی ئەوەی دڵی چۆن بێت لەگەڵ پەروەردگاریدا پەروەردگاریش بەو شێوەیە دەبێت لەگەڵیدا دەی خوایە گیان باوکم بخەرە ژێر سایەو سێبەری میهرەبانی خۆتەوە و گۆڕەکەی بکەرە باخێك لە باخەکانی بەهەشت و حەوانەوەی دوای چەندین ساڵ لە ماندوبون و نەبونی بکەرە بشی لە نێو گۆڕەکەیدا، یەکێك لەو سیفەتە جوانانەی کە زۆر بە ئاشکرا بەم بەندەیەتەوە دیاربو سینە سافی و بێ گەردی دڵی بو ئەمەیش یە کێکە لە سیفەتە جوانەکانی خۆت کەواتە لە دەروازەی پڕ میهری خۆت داوام هەیەو دەلاڵێمەوە لە گەڵیدا میهرەبان بەو لە گوناهەکانی خۆشببە ... امین ، هەر لێرەشەوە دەمەوێت سوپاس و خۆشەویستی و ئەمەکناسی خۆم بۆ برای بەڕێزۆ شاعیری هەست ناسکی هەورامانی دڵڕفێن بکەم کاکە (گۆران عەباس) کە بەڕاستی لەدوای ئەوەی داوام لەچەند هاوڕێیەکی خۆی کری کە پێدا چونەوە بۆ دیوانەکە بکەن بەڵام مەخابن نەهاتن بەدەم داواکەمەوە کاك گۆرانی ڕۆح سوك بەسینەیەکی فراوان و زەردە خەنەیەکی ڕاستگۆیانەوە داواکەی نەشکاندمو بڕیاری دالەگەڵما بێت هەتا بە ئەنجام گەیاندنی ئەم بەرهەمە بۆیە باشترین دیاری لای منێکی هەژاری بێ دەسەڵات لە بەرامبەر پەروەردگاری باڵادەستەوە بۆ ئەم برائازیزەم تەنها نزایەکە ئەویش ئەوەیە پێ ی دەڵێم برای ئازیزم .. ئەگەر پاداشتی کارو ماندوبونەکان لای مرۆڤەکان بێت ئەوا زۆر زو ئەو پاداشتە کۆتایی دێتو دەکەوێتە ژێر پەردەی بیرچونەوەوە بە لام کاکە گۆران من داوا دەکەم تەنها پاداشتی ماندوبونەکانت لەم کارەو سەرجەم کارەکانی تردا هەر لای زاتی (الله) بێت چونکە ئەو زاتە هیچ پاداشتێك ون ناکات و هەتاهەتاییە.

هەروەها لێرەوە بەحەقی خۆی دەزانم وەك وەفاو ئەمەناسیەك بۆ خاڵی بەرێزم (شێخ حسێن شێخ عوسمان نێر گزەجاڕی) کە بەڕاستی پەیوەندیەکی زۆر ڕاستگۆیانە و بێ گەردیان هەبو لەگەڵ باو کمدا وە زۆر جاریش پێکەوە مشتومڕیان دەکرد لەسەر ئەم بەرهەمە ... هەروەما ڕێزو خۆشەویستیم بۆ دایکی میهرەبانم کە بەڕاستی پاڵپشتێکی دڵسۆز بو بۆ باوکم و هەمیشە لە پاڵ پەڕەو کتێب و کەرەسەی نوسینەکانیدا قۆری و پیاڵەکەی ئامادەبو و دەبوت بابەهۆی ماندوبونیەوە سەری نەیەشێت ..
دایەگیان هەرگیز ئەو ساتانەم لە یاد ناچێت کە باوکی بەڕێزم هەتا درەنگانێکی زۆر سەرقاڵی کاری ئەم دیوانە بو تۆیش بە دیاریەوە دادەنیشتیت و شەو نخنیت دە کێشا بۆ بەیانیش لە پێش ئەوەوە هەڵدەسایت و سەرقاڵی ئامادە کردنی نانو چایی بەیانی و ڕێك پۆشکردنی بوی، ئێستایش دایەگیان لە دوای ئەوەی باوکی ئازیزم چۆتە لای ئامێزی پڕ میهرەبانی خوای خۆی هەرغەمی ئەوەتە و پێم دەڵێیت هەرچیەکت کردووە بەڵکو حەجێکی بۆ بکەیت .
باوکەگیان دوا ووتەم بۆتۆی بەڕێز ئەوەیە ئەوەندە لای خوا بەڕێز بیت لە ڕۆژانی ڕەستاخێزدا بتوانیت شەفاعەتێك بۆ ئەم کوڕەگوناهبارە ت بکەیت هەروەها سوپاس و خۆشەویستیم هەیە بۆ بەڕێز مامۆستا مەلا صالحی هۆرێنی چونکە بەڕاستی زۆر غەم خۆری باوکم بو زۆریش یەکیان خۆش دەویست ، لە کۆتایدا ئەگەر هەرکەسێکم لە یاد چوە لەم ووتە کورتەدا باسی بکەم داوای گەردن ئازادی دەکەم (سبحان ربك رب الغزة عما يصفون و سلام علي المرسلين و الحمد لله رب العالمين)
و السلام عليكم و رحمه الله و بركاته

ئامانج محمد ئەمین حەبیب ئەردەڵانی

٢٠٠٨/٦/٢٢

سێ شەممە

# پێشەکی

**سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای بەخشندەو میهرەبان، هەزاران درووودو سڵاو بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری رابەرو خۆشەویستمان و، بۆ یاران و یاوەران و بۆ پەیرەوانی تا رۆژی دوایی.**

**کێ دەهات بەخەیاڵیدا و کێ بە بیرو هۆشی بۆنەوە دەچوو کەقەدەر دەیەوێت ئاورێکی پڕ لەسۆز لەناوچەیەك بداتەوە کە هەمیشە گیرۆدەی چنگی تیژی درندەی نەزانین و کۆیلەو دیلی تاریکیی شەوانی شەوگارانی نائومێدی بووە؟.**

**خودا وەختێ کەویستی بەندەیەکی خۆی بکا خۆشنوود**

**لەرێگای دوورەوە بۆی دێ بە پێی خۆی شاهیدی مەقسوود[1]**

**( یوسف جان ) ی باپیرە گەورەی پێنجەم مەولەوی لەزانای گەورەی بەناوبانگ مەلا ( ابوبکر ) ی ( مصنف ) ە[2] لەبەر هەرهۆیەك بووبێ ، دێی( چۆڕ ) بە جێ دێڵێ و لەناوچەی ( تاوەگۆز ) دەگیرسێتەوە بۆ ئەوەی مەولەوی تیایدا لە دایك ببێت و بیکا بەمەڵبەندو نشینگەی هەمیشەیی خۆی و تیایدا بحەسێتەوە.**

**( واللە یعلم حیث یجعل رسالتە ) (( صدق اللە العظیم )).**

---

[1] شێخ رەزای تاڵەبانی ، خوا لێی خۆشبێ .

[2] لەدێی ( چۆڕ ) ی (( مەریوان ) ) لەکوردستانی ئەردەڵان دانیشتووە، لەبەر ئەوە کتێبی دانراوی زۆرە بە( مصنف ) ناوبانگی دەرکردووە، گرنگترین دانراوەکانی( وضوح ) ە لەفیقهی شافیعیداو، لەچوار بەرگی قەبەدا، مامۆستا سەیید( عارف ) ی ( تەپەکەل ) ی( ١٩١٠-١٩٧٥ )، خوا لێی خۆشبێ پەراوێزێکی فراوانی بەنرخی لەسەر کتێبی ناوبراو نووسیوە، ئاخ بۆ موسڵمانێکی ساماندار بە چاپی بگەیاندایە ئەم زاتە بەچەند رۆژێ پێش مردنی – وەکو (( مەردۆخ )) لە کتێبی( کوردو کوردستان ) ە کەیدا باسی دەکات بە زمانی فریشتەوە لە توێی دوو بەیتی فارسیدا مێژووی ساڵی مردن خۆی بە وشەی( خیر مقدم ) کە بە پیتی ئەبجەدی دەکاتە ( ٩٩٤ ) ی کۆچی دیاری دەکا. ئەوەو ئەوەزاکانی ناو بەناو دێی چۆڕیان بەجێ هێشتووەو لە ناوچەکانی کەی کوردستاندا نیشتەجێ بون لەوانە ؛ شێخانی( بێلەنگە ) و( تەپەکەل ) لەنزیکی هەڵەبجەو، شێخانی زەنبیل لەناوچەی مەهاباد لەکوردستانی ئێران و، بنەماڵەی شێخ ئەمینی خاڵ لەسلێمانی، وەبەرەی مەلا و مەولەوی لەناوچەی تاوەگۆز، وەساداتی دێی( باخچە ) لەبناری شارەزوور کەمامۆستایان عومەرو عوسمان و کاك عادیل و چەند برایەکی تریان ، کوڕانی حاجی سەیید قادری باخچەیین و لەم ئەژادو رەسەنە پاکەن.

ئاوره پڕ سۆزو میهرەبانی یەکەی قەدەر هاتە دی: لە بیستەکانی سەدەی سیازدەهەمی کۆچیدا لەم بنەماڵە بەرزو ڕەسەنە مەولەوی لەو( تاوەگۆزە )[٣] هاتە دنیای کوردستانەوە، هاتنەکەی بوو بە گزنگی خۆر نەك هەر بۆ ئەو ناوچەیەی دەورو بەری بەتەنیا، بەڵکو بۆ هەموو کوردستان و بۆهەموو جیهانی ئەدەبی کوردەواری.

بەختەوەری شادمانی بۆ یەکەمین جار بە پێکەنینەوە ڕۆژباشیان کرد لە دەماخی بەرزی ( تاوەگۆز ) و لە لوتکەی چیا سەرکەشەکانی جیهانی کوردستان و ئەدەب،

واتە مەولەویی داهێنەرو هونەرمەند و بلیمەت تیایدا هاتە دنیاوە.

پیرە مێرد( ١٨٦٧-١٩٥٠-ز) کەتەمەنی لەدەورو بەری ( ١٥ ) ساڵیدا بووە مەولەوی دیوە، دەڵێ: (من خۆم دیومە، زاتێکی میانەباڵاو ڕیشێکی تەنك، دوو چاوی بە ڕەونەق و پڕجلیوە... گفتوگۆ لەسەرخۆ ، هەروەك شێخی( ضیاء الدین ) دانە دانەو بە نوکتەو نیم خەندەیەکی بەمەعنا کەئیمای دڵپاکی و ڕووناکی بکا.

جار جار ئاهێکی بە سۆز کەلە کوورەی دەرونێکی پڕ عیشقی مەعنەوی دەهاتە دەرێ، وەك ( توجهی ) شێخێکی نەقشی( تأیید ) ی ( رابطە ) ی کردو بەو عیشقەوە بە جۆش . ئەمە مەولەوی خۆی، ئەمیشە شیعرەکانی وەك ئاوی حەیات لە توێی میدادا). پاش تەواوکردنی خوێندنی سەرەتایی لای باوکی بەڕێزی، -بەپێی یاسای ئەو سەردەمە- بەناوی فەقێتی یەوە دەچێ بۆ زانستگاکانی کوردستان و ڕێگای زانست و زانین دەگرێتە بەرو دەڕوا.

---

[٣] مامۆستا ( علاء الدین ) ی سەجادی ، دەربارەی وشەی ( تاوەگۆز ) دەفەرموێ:

ئەو شوێنە کە ( یوسف جان ) ی ناوبراو( باپیرە گەورەی پێنجەمی مەولەوی- وەرگێر ) ئاوەدانی کردۆتەوە: کانی و سەرئاوێك بووە، بێ ئاوەدانی، داری( تاوگ ) و ( گوێز ) ی لێ بووە ، لە پاشا ئەو دێ یە هەر بەو ناوەوە ناوبانگ دەستێنێ ، جا بۆ سووکیی لەسەر زبان ئەبێ بە تاوەگۆز)

زنجیرە مێژووی ژیانی خاوێنی مەولەوی – وەك وترا- لە زۆربەی ڕووەکانیەوە ئاشکرا نییە: کەی لە دایك بووەو، کەی و لای کێ ئیجازەی وەرگرتووەو، کەی کەوتۆتە سەر ڕێگای ( تصوف )و، کەی ژنی هێناوەو، چەند منداڵی بووە...، سەجادی دەڵێ : لەشاری ( سنە ) و لە مزگەوتی ( دار الاحسان ) لای حاجی مەلا ئەحمەدی نودشەیی و ، عبدالکریمی مدرس: لە سلێمانی و لەمزگەوتی (مەڵکەندی) و، لەسەردەمی ئەحمەد پاشای باباندا لای مەلا( عبدالرحمان ) ی باوکی ناوبراو ئیجازەی وەرگرتووە. ئەم دوو ڕایەش هەر یەکەیان لە ڕوویەکەوە ڕەخنەیان دێتە سەرو ، تەواو و ڕەسا نین.

لەماوەی گەشتەکەیدا بەچاوی خۆی دەیان کۆڕی زانست و زانیاری دی، وەلەناخیەوە لەشێوەو شێوازی ژیان وچۆنیەتی ڕێبازی بیرو هۆشیان گەیشت و لەهەموو ڕووەیەکەوەشودی لێ وەرگرتن و هەڵیسەنگاندن و، کردنی بەبناخەوبنچینەو ئیلهامی شیعرو ئەدەب و خەیاڵ، تا لە پاشە ڕۆژدا ئەدەبەکەی کرچ و کاڵ و لەڕو لاواز نەبێ.

بەڵێ ئەم بلیمەتە سەودای خوێندن و شەیدای جوانی و کەڵکەڵەی نیگاری پڕ ئەفسوونی سروشتی پەنجەی تەوانای کردگارکەوتە سەری، بەچاوی خۆی دیمەنە قەشەنگە جۆربەجۆرەکانی کوردستانی دی، چاوی بەگەرمیان و کوێستان و چیاو چیمەن و، چەم و سەوزەو شەتاو و، تاڤگەو بەفرو بەفراوان و...نزارو قەدپاڵ و شیوو دۆڵدا گێڕا.

ئەمانە هەموویان کاریان تێ کردو بۆی بوون بە پاڵپێوەنەرێکی خۆیی و لە بارێکەوە ژیانی گۆڕا بۆ بارێکی تر، بۆیە –وەك دیینی-هەڵبەستەکانی و ناسکنارایی یەکانی لەگەڵ جوانی و شەنگی و شنەو شنۆی سروەی سروشتدا وەك ئاشقەو ماشقە ئالاون بەیەکداو، ئاشنای ڕەگ و ڕیشەی گیانی یەکترین.

لەم گەشتەیدا زۆر دێهات و شاران گەڕاو، زۆر مەڵبەندی زانست و وێژەو ئەدەبی دی، لەوانە: سنە، مەهاباد، بانە، جوانڕۆ، پاوە،زەهاو، سلێمانی و، هەورامان و زۆر شوێنانی تر.

لەکۆتایی گەشتەکەیدا لە پایتەختەکەی بابان و شارە خنجیلانەکەی شاری سلێمانی، لای عەللامەی بەناوبانگ مەلا (عەبدالرحمان) نۆدشەیی لەمزگەوتی (مەڵکەندی) ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێت، ئینجا لەدێی (چڕوستانە)ی (ئەوروڵی) لەڕۆژئاوای (هەڵەبجە) نیشتەجێ دەبێ، بۆماوەیەك لەوێدا بەوانە وتنەوەوە خەریك دەبێت، لەم گوندەدا (عەنبەر خاتون) دەبێ بەخێزانی، باخێکی گەورە ئەنێژێت-ئێستاش باخەکە ماوە- هەندێ مەڕو ماڵات پێکەوە دەنێ، شێخ محەممەدی کوڕی کە تازە پێ دەگا کوڕێکی نازاو هەڵکەوتوو دەبێ مەولەوی لە پەنایدا دەحەسێتەوەو، بەکامەرانی ژیان دەباتە سەرو وانەی خۆی ئەڵێتەوە.

پاشان ناکۆکی لەنێوان جافەکان و دەوڵەتی عوسمانیدا ڕوودەدا، ئینجا بۆ سەرکەوتی جافەکان بەڕابەرێتیی حەمە پاشا، هێزێکی چەکدار بەفەرماندەی (عومەر پاشای سەردار) پەلاماری هەڵەبجەو دەوروبەری دەداو جافەکان دەشکێن و لەناوچەی (شەمێران) و کەژی (زمناکۆ) خۆیان دەگرنەوە، لەئەنجامدا گوندی (چڕوستانە) و چەند گوندێکی تر دەسووتێ، مەولەویش ناچار دەبێ چڕوستانە بەجێ دێڵێ و لەدێی(وڵومر) لەشەمێران

نیشتەجێ دەبێ، وەك لەهەندێ پیاوانی تەمەن درێژ وەرگیراوە ژیانی بەرەو باشی دەڕوات و خەمی نامێنێ و خۆی و کەسەکانی بەجوانی دەژین و دەحەسێنەوە، چونکە شێخ عەلی عەبابەیلێیی کەلەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە سەرکاری شەمێران دەبێ، بەشێوەیەکی دڵسۆزانە زۆر خزمەتی مەولەوی و کەسوکارەکەی دەکات و ڕێزیان دەگرێت، بەم بۆنەیەوە بەباشی دەژین و دەحەسێنەوە، ماڵ سووتاوی دەربەدەرییان لەبیر ئەچێتەوەو هەست بەکەم و کورپی ژیان ناکەن، بەکشت و کاڵ و چاندنەوە خۆیان خەریك ئەکەن.

پاشان لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە شەمێران دەدرێ بە( حەمە پاشا ) ی جاف و شێخ عەلی ناوبراو دەردەکاو ( عوسمانی خاڵە ) ئەخاتە شوێنەکەی، بەم کارە مەولەوی ژیانی ئاڵۆزو شپرزەو تاریك دەبێ، زەوی زارو کێڵگەو بەراوەکان لەمەولەوی و کەس وکارەکەی دەسێننەوەو ئازاریان دەدەن.

هۆی دانانی عوسمانی خاڵەو لابردنی شێخ عەلی، وەك لەجەنابی حەمە سەعیدی شەمێرانی و چەند کەسانی ترم بیستووە- ئەمەیە: عەشیرەتی گەڵباخی و مەریوانی لەپەنای دوژمنایەتیدا لەسەر شیوی مەریوان پەلاماری جافەکان دەدەن ، قەڵای ( خاومیراوا ) یان لێ دەسێننەوەو داگیری دەکەن، جافەکانیش بەمە زۆر دڵگیر دەبن و دەکەونە مەترسییەوە، پاشان ( حەمە پاشا ) دەڵێ: ( هەکەس دوژمن لەو قەلایە دەرکا چی داوا بکا من خاوەنی نیم و هەتا هەتایە ڕێزی لەسەرسەرم، عوسمانی خاڵە گورج بەم کارە هەڵدەسێ، خۆی و شەمێرانییەکان بەمەردانە پەلاماری دوژمن دەدەن و قەڵاکە دەگێڕنەوە بۆ جافەکان، لەئەنجامی ئەم کارەدا حەمە پاشا شەمێران دەدا بە عوسمانی خاڵە و شێخ عەلی دەردەکا.

دوای ئەم ئاڵوگۆڕە شەمێرانییەکان جێ بەمەولەوی و خزمەکانی لێژ ئەکەن و لەتەکیاندا ناگونجێن، وا دەردەکەوێ بەهاندانی حەمە پاشا عوسمانی خاڵە زەمینە خۆش دەکا بۆ ئەوەی شەمێرانییەکان بەرامبەر بەمەولەوی و کۆمەڵەکەی باش نەبن و لە ئازاردانیان نەوستن، ئەمانیش ناچار دەبن دەڕۆن بۆ تاوەگۆزو لەدێی( سەرشاتە ) جێگیر دەبن.

ئەم ناکۆکییە بە ئاشکراو بەزەقی لەقەصیدەی فارسی یەکەی خودی مەولەویدا دەردەکەوێ.

مەولەوی لەدواساڵەکانی ژیانیدا تووشی چەند گیروگرفتێکی لەشی و دەروونی دەبێ، تەوانایی وهێزی نامێنێ و لەگۆ ئەکەوێ، لەسەرووی هەموویانەوە مردنی( عەنبەر خاتوون )

ی خێزانی، بەمردنی ئەم ژنە هەڵکەوتووەی سەوزەی ژیانی دەژاکێ و نائومێدی و نەهاتی
رووی تێ دەکا. لەلایەکی دیکەوە چاوە گەشەکانی نابینا دەبن و سۆمایی یان نامێنێ . وەك
بەچەند ساڵێ پێش مردنی پشتی دەشکێ و بۆ ماوەیەکی زۆر بەبێ نازی ( عەنبەر خاتوون )
ی لەسەر جێی کەساسی بەئازارو هەناسە ساردی یەوە ئەتلێتەوە. وەك دەبینی بەم بەیتەی
پەنجە بۆ ئەم کەساسییەی رادەکێشێ:

پیری و فەقیری و کەسیفی هەرسێ
نەبۆ وە هیجران بار هیچ کەسێ

ئەم کۆسپە دەروون تاریکانە بەکاری قەدەرو کردەی ناپەسەندی کۆمەڵ دەرگایان پێ گرت و
جل و بەرگی کامەرانی یان لەبەر دڕانی و، سوێ یان دایە و ئازاریان لە دڵە ناسکەکەیدا
چاندو ڕۆژی رووناکیان لێ کرد بەشەوی تاریك تار،
دیسان بەکاری قەدەرو بەکاری کۆمەڵی نەزان و ئاست نزم لەبەختی سیای مەولەوی و
لەبەختی رەشی ئاڵۆزی گەلی کورد، کتێبخانەکەی لەئەنجامی جەنگی خێڵایەتیدا سووتاو
پەڕەی کاغەزی بۆدەرنەچوو، ئیتر مەولەوی هەق و مافی خۆیەتی بڵێ:

دەمەی هەناسەی گەرمی نارەکەم
ئەکوورەی دەروون پڕ جەخارەکەم
ئایر دان حوجرەی دڵەی پڕ دەردم
سۆچنان کتاو مەجمووعەی فەردم

تالە ساڵی ( ۱۳۰۰-ك ) دا ماڵئاوایی لە ژیان و کۆمەڵ و ئەدەب و زانین کردو بەرەو چۆڵگەی
عەدەم بنەو بارەگای پێچایەوە، لەرۆژهەڵاتی گوندی ( سەرشاتە ) بۆ ئەبەد بوو بە میوانی
گۆڕو دڵەکەی لە جووڵە وەستا، بەدیمەن لە ئێمە ئاوا بوو، بەڵام هەرگیز بە گیان لە ئێمە
ئاوا نابێ و، لەدڵماندایە و لە بیر ناچێتەوە. هەزاران درووود لە گیانی خاوێنی بە ڕوو

سووری ژیاو بەسەربەستی و سەربەرزی ڕۆژگاری پێچایەوە، (سلام علیه یوم ولد ویوم یموت و یوم یبعث حیا).

جگە لە(عەنبەر خاتوون) ژنی تری نەهێناوە، لەم ژنە چەند کوڕی بووە، ئەوانەیان کەدیارن ئەمانەن: شێخ محەممەد، سەیید محەممەد ، سەیید (عەبدوڵڵا)، سەیید هیدایەت، ئەمەی دوایی یان بە منداڵی مردووە و نەوەی نییە، جگەلەمانە مەولەوی کوڕو کچی تری بووە، بەڵام بەمنداڵی مردوون و ساڵ و ڕۆژ و شوێنی مردنیان و شێوەی ژیانیان لە ئێمە گومن و نایانزانین.

نەوەکانی مەولەوی هیچیان مووچەخۆرو کاربەدەست نین وبە ڕەنجەشانی خۆیان ئەژین، لەناوکۆمەڵدا زۆر بەنرخن وجێگەی باوڕی هەموو کۆمەڵگەی دەوروبەری خۆیانن، هەروەك باپیرە گەورەیان (مەولەوی) خاوەنی سامان ودارایی وکۆشك و تەلارنین و خاوەنی قەناعەتێکی بێ تەماع وسەرەڕۆنین، دژی هەڵپەی ناڕەوان و خۆیان لە حەرام بپارێزن و نزیکی ناکەون.

ئێستا لەم سەردەمەدا بە شێوەو نەریتیی خێلآیەتی جەنابی سەیید (عبدالرحمان) ی سەیید عەلیی شێخ محەممەدی کوڕی مەولەوی بە گەورەو سەرۆکی هۆزی مەولەوی ناسراوە، پیاوێکی چاوکراوەو ژیرو وردو قسە زانە.

لەبەرگی دووەمی ئەم دیوانەدا بە یارمەتی خوای گەورە بەدرێژی لەنەوەی مەولەوی ئەکۆڵمەوە.

ئێستا نەوەکانی لە کۆمەڵگەی ی (زەڕایەن) لەناوچەی شارەزوور دادەنیشن.

# هێزو بڕشتی شیعری مەولەوی و خەیاڵی ناسکی

جێی گومان و دوو دڵی نییە. مەولەوی خاوەنی خەیاڵێکی بەر بڵاو و بەدەرەتان و ئاسۆیەکی نیگار فراوانی هەیە. ناسکی و نەزاکەتی هەڵبەستی لەهەر لایەنێکەوە بیگری لەوپەڕی جوانکاری و بێ گەردیدایە. پیرەمێرد واتەنی (وەك ئاوی حەیات لە توێی میدادا) یە..

ئەگەر خانای قوبادی و بێسارانی.. لە ڕووی گەشەو پەرەپێدانی ناوەرۆکەوە.. تا ڕادەیەك تاکەرەوەی شیعری هەورامانین، ئەوە بێ گومان مەولەوی توانیوێتی بە وەستایانە شیعری گۆرانی گەشەدارتر بکاو، بی گوێزێتەوە بۆ گوڵشەنێکی تازەی تەڕوبڕترو، بۆهەوارگەیەکی دڵگیرتر، توانی بەسە ڕکەوتوانە چێژ و کێش وپێزێکی ئەوتۆی بداتێ نەك بەتەنیا لەتەك ڕێبازی ڕۆژگارانی مەولەویدا بگونجێ، بەڵکو بە کارامەیی لەگەڵ تەوژمی تازەو تازەترداو لەهەموو بوارەکانی بەگشتی بساچێ وتەفاعول بکا، بەمەرجێ هەمان جیلوەو بێ گەردی و بڕشتی.. بمێنێ.

ڕێبازی شیعری مەولەوی هەرچەند لەسەدا سەد وەرگێڕانێکی جۆری و (ئەوعی) نەبوو، بەڵام وەك ئاشگرایە وجێی دوو دڵی نییە توانی بەوەستایانە شیعری هەورامی لە (خەت و خەڵ و زوڵفی لوول و قژی کاڵ و زەرد..ڕزگار بکات، وەبەشێوەیەکی نوێ توانی جیلوەو جوانی و نیگاری سیحراویی سروشت بکا بە ئارایش و زینەت و ژیای شیعرو هۆنراوە، بە شێوەیەکی ئەوتۆ ڕازاندنیەوە سەرنج و نیگای هەموو هەستێکی ناسك ڕابکێشێ و بیخاتە سەر بەزمی ئاهەنگی جۆش و خرۆش یەکەم شاعیر بووە توانبێتی بە قووڵی و وردی (تصوف) و مەی وئەی ودەف بکا بەهەوێن و خەمرەی موفرەداتی هەڵبەست و پێکیانەوە بشێلێت و تەفاعولیان پێ بکات و نیگارە دڵڕفێنەکانی سروشت بەیەخەو بەرۆکیاندا هەڵواسێ.

شاعیرێتیی مەولەوی ئەتوانم بڵێم گەیشتۆتە سنووری ئیعجازو ئیبداع : کێ توانیوێتی شیعری فێرکردن (الشعر التعليمي) بەشێوەیەکی کاریگەری داڕێژێت و کار بکاتە سەر هەست و دڵ و دەروون ؟ . چاوێك بگێڕە بە (باوەڕ نامە) کەیدا کە بە زاراوەی جافی جوانرۆیی دای ڕشتووەولە (زانستیی کەلام) ئەدوێت، ئەو کاتە بۆت دەردەکەوێت کەچۆن ئەو بابەتە وشکە تەعلیمی یەی هۆنیوەتەوە و هەست دەبزوێنێ و دڵی مرۆ پاراو ئەکا، ئەمەش جگە لە شێوەی داڕشتنی دیباچەکەی کەبەوێنەو دیمەنێکی کەس نەدیوەوە خستوویەتیە ناو چوارچێوەیەکی داهێنانەوە.

لەو باوەڕەدا مەبە لەکۆن تا تازە هیچ هەستیارێك تونیبێتی وەکو مەولەوی لە شوێنی خۆیدا و بە وەستایانە چووبێتە ناخی خەمریاتەوەو لەهەست و ئاواتی جۆر بە جۆری خۆیدا بەکاری هێنابێ، وەیا لە لاواندنەوەو شیندا بە شێوەی گشتی کەسێك توانبێتی پێش بڕکێ بکا لەگەڵ مەولەویدا !.

ئەوە باسی سەوەزەو نم و شەونم و شنەو شنۆی بای (سەحەر) و کەروێشکەی سەوزەی بەهاران و هاژەی چەمان و سەراوان، وەیا پرچی درێژی چنوورو پەلکی بەڕەزاو ، بڵاوبوونەوەیان بەسە ر تاشە بەردەکاندا، وەیا لەلایەکی کەوە فرمێسك و ئاخ و ئۆف و ساردیی هەناسان.. هەر مەکەو لەسەری مەڕۆ، بەکار هێنانی ئەم بابەتانەو بابەتەکانی تری سروشت لە توێی هەڵبەستەکانیدا، هەریەکەیان لەلاپەڕەی رۆژگاراندا تابلۆیەکی زیندوون و نەبێزراون، وێنەیان یا نییە وەیا زۆر کەمە.

شاعیرمان لەهەڵبەستەکانیدا پەنای نەبردۆتەوە بەر وشەی بێگانەو قورس و نالەبار هەموو بابەتەکانی زانستیی (ڕەوان بێژی) و جوانکاری و(معان) ی وەك جیناس و تەورییە و بابەتە زانستی یەکانی (بەیان) و (مەعان) و (بەدیع) و جوان ئاراییی بەکار هێناوە.

مەولەوی بە شێوەی سروشتی ئاراو نیازو هەستی خۆی دەردەبڕێ و نایەوێ زنجیرەی ئەفکاری بپچڕێت، یەکگرتنی بابەت و ناوەرۆك لای مەولەوی مەرجەو کەمتر لێی لا ئەدا، بابەتەکانی سروشتیی بە شێوەیەك دەیان هۆنێتەوە و لەدڵاندا بەوپەڕی وەستایی و کاریگەری یەوە دەیان چەسپێنێ خوێنەر هۆگرو عاشقی دیمەنە جوانەکانی کوردستان ئەکاو خۆشەویستییان لە مێشکدا دەچێنێ.

مەولەوی لەگۆشەیەکی خۆشەویستییەوە کوردستان دەڕەنگێنێ ودەچێتەناخ وقووڵایی خۆشەویستی وبایەخ پێدانیەوەلەم ڕووەوەبۆم هەیە بڵێم مەولەوی شاعیرێکی نیشتمان پەروەرو شەیدای کوردستان بووە.

لەو بابەتەیدا کەتیایاندا بەملکەچی و زەبوونی و کەساسی لەخودای گەورە دەپاڕێتەوەو ڕوو دەکاتە بارەگاکەی، بەشێوەیەك دایان دەڕێژێ لەزۆربەیاندا ئیبداع و داهێنانی تێدایەو، بەوپەڕی کاریگەرییەو کار دەکەنە سەر خوێنەری دڵگەرم و باوەڕ بتەو، شا قەصیدەکانی کەبە پاڵنەری دەروونییەوە وتوونی بەشێوەی سیحراوی دڵان دەکرن و دەستەمۆیان دەکەن، وەیا ئەو چەمانەی کەلەکەشەکان و وەرزەکانی ساڵ ئەدوێ و لەبوارە جۆربەجۆرەکانی تردا ووتونی ، دەبینی لەچوار چێوەی داهێنـاندا دەیانڕەنگێنێ؟.. شایان ئەوەن بەدەرگای (کەعبە) و سنگی گەردووندا هەڵواسرێن.

زۆربەی هەڵبەستەکانی وەڵامن بۆ دۆستان و یارانی، بۆیە بە پێی بەرزی نزمی وبە پێی پلەی ئاست و ئاسۆی تێگەیشتنی ئەوان وەڵام ئەداتەوە، بۆیە ئەو شیعرانەی لە ڕووی بەرزی و نزمیی ناوەڕۆکیانەوە هەندێکیان لەهەندێ تریان جیاوازن، و بەرزی و نزمیی مانایان پێوە دیارە.
چامە دەروونییەکانی – ئەوانەی کەبە هەستی دەروونیەوە وتوونی- هەموویان ئیبداع و لەو پەڕی جوانکاریدان و زادەی مێشکێکی تر نین.
خاسییەتی چامەکانی مەولەوی و ڕواڵەتەکانی :
مەولەوی- بەهۆی بێ فیزیەوە –بە بەرزی و جوانکاری وداهێنانی هۆنراوە شارەکانیەوە خۆی هەڵنەکێشاوە، لەئاستی دۆستان و هاوەڵان و مامۆستایانیدا بەو پەڕی نزمی و بچوکییەوە خۆی پیشان داوە ، هەربۆیە وشەی (مەعدووم ))ی کردووە بە نازناوی خۆی گوایە شایستەی ئەوەی نی یە لەبووندا هەڵقەیەك بێ لەئەژادی مرۆی بەسوود .
یەکەم: چەند بەیتێك دەکا بە کلیل و دەرگای باسەکەی پێ دەکاتەوە ، لەناخی باسەکەدا گیرو گرفتەکە (ا یجاباً و سلباً)شەن و کەو ئەکا ، لەدوایدا بەجۆرێك قەصیدەکە دادەخاکە بوارو گوزەری قسە نەمێنێ.
دووەم: هەموو تاکتاکی بەیتەکانی –تاك و تەرایان نەبێ-خاوەنی یەك وەزن و یەك کێش ویەك قافییە نیگارەکانتان و، بەئەندازەی ژمارەی پەنجوی دەستن، پەیڕەو (.غەسلی)) بێگانەی نەکردووە .
سێیەم: وەکو شاعیرەکانی تر وشەی (مەعدوم) ی لەدوا بەیتی هەموو چامەکانیدا نەنووسیوە. جاری وا هەیە ئەم نازناوە لەسەرەتاوە، وەیا لەیەکێك لەبەیتە میانەیی یەکاندا بەکاری دێنێ.
چوارەم: مەولەوی لە هەجوو واتە(داشۆرین) خۆی پەناداوەو بەدەگمەن نەبێ ئەی کردووە بەبەرنامەو تیایدا سەرو دڵی کەسان بگرێ. لەیەکێ لەقەصیدە فارسی یەکانیدا لەم بەیتەدا جۆرە ئاوازو مۆسیقایەکی زبری لێ ئەوەشێتەوە کەدەربارەی هەندێ کەسانی هۆزی "ئیزان بەخشی" واتە "شەمێرانییەکان" ئەفەرموێ:

هەرکەسێ پرسی ئەو کوڵتە چی یە؟
وەبێ شك ئەوە (ئیزان بەخش) ی یە
بەگ چە دندانش بیاید سەگ شود
سەگ چە دندانش بیفتد بەگ شود

ئەمانە لای مەولەوی نموونەیان کەمەو زۆر بەدەگمەن دەکەوێتە بە رچاو.

پێنجەم: خەم خواردن و هەناسە ساردی و دوودڵی دەردان و تەم ومژی نائومێدی... بە ئاسمانی شیعرەکانیەوە دیارە، لەزۆربەی نووسنەکانیدا بەم جۆرەی خوارەوە دەکەوێتە بەرچاو و ئەڵێ:

بەجلو بەرگێکی تان و پۆ ماتەمینی و خەماوییەوە، بەچاوێکی پڕ لە فرمێسك و ئەسرینی دووریی یارانیەوە، لەنەشکەوتێکی دیمەن تاریکی بەخەم سواخ دراو بەربەرەڵاداو، بەسەر لوتکەی چیایەکی گەردن کەشی بەتەم دا پۆشراوەوەدانیشتووە و پەیتا پەیتا بەچاوی خەیاڵی نائومێدی یەوە خەم و حەسرەت چاو بەم جیهانەدا دەگێڕێ و خۆی دەنوێنێ.

شیعری مەولەوی تا بڵێی پاراو تەڕو پڕن و جوانکاریی یان بەڕەنگ و ڕوخساریانەوە بەدی دەکرێ و ئاشکرا یە.

عەلادین سەجادی- خوا لێی خۆشبێ - دەڵێ: (بەبێ شك مەولەوی بەرزترین شاعیری سەردەمی نۆزدەهەمی کوردە، تا ئەم تاریخەو بگرە پێشتریش، ئەوەك هەر ئەوەندە، بەڵکو ئەگەر بەراووردی شیعری مەولەوی لەگەڵ شاعیرەکان نۆزدەهەمی غەیری کورددا بکرێ، هەموو زمان و قەڵەمێك دان بەوەدا دەنێ کەفیکری بەرزی مەولەوی لەسەرووی هەموویانەوەیە، ناسکیی خەیاڵ، تیژی بیرو وردیی مەعنا و جوانیی وشەو ڕاکێشانی دڵ بە عیباراتی ڕەنگین و، بزواندنی تەلی عاتیفە مەگەر هەر لەدەست مەولەوی هاتبێ).

دیلانی شاعیری ناسك خەیاڵمان دەڵێ: هەر بەیتێکی مەولەوی بگری، تابلۆیەکی بێ وێنەیە...، دیلان، بەلایەوە کوفرە بەشیعری مەولەوی بوترێ کلاسیکی..

پیرەمێرد: ( شیعرەکانی مەولەوی وەك ئاوی حەیات لە توێی میدادا..)

وەدەڵێ: ( ..بەووتەی خۆم نەبێ ئەدیبیاتی زۆر قەوم و ناودارانی زۆر میللەتم دیوە هیچیان ئەوندەی ڕۆحی مەولەوی پڕ جۆش و خرۆش نی یە..) هەروەها دەڵێ : (گۆرانی شاعیرمان ویستی قەصیدەیەکی مەولەوی وەرگێڕێتە سەر زمانی عەرەبی، بەڵام کە سەیری کرد هەمووی هەڵبژاردەیە). سەیری دیوانی (ئەصل وڕۆح) بکە.

گۆرانی شاعیر دەڵێ: (من لە شیعردا ئیلهامم لەمەولەوی وەرگرتووە).

شێخ محەممەدی خاڵ: (مەولەوی جێی سەرسوڕمانە کە شیعری زۆری هەیە و زادەی بیری خۆیەتی و بەبیری کەسی تردا نەهاتووە، ئەم حەوت بەیتەی خوارەوە بەلای (خاڵ) ەوە هەندێکن لە ئیبداع و جوانکاریی یەکانی مەولەوی:

ڕوخسارش، فەصڵی مەسقەڵ مدۆ لێش
وەشنۆی پارێز خەیاڵ مبۆ ڕێش *

***

باڵەخانەی چەم دیوانەکەی تۆن
بانە تاو وەك خاك ئاسانەکەی تۆن
تکەش عاجز کەرد خەیاڵت تێشدا
ئازیز! بۆ جارێ پابنیە پێشدا

***

خەم بیم یانێ های پێم مدۆ خەبەر
جەدەرگای هەستی تەشریف بەر ئەودەر
پۆس تە پڵ گۆش ئم کێشان کەم کەم
ئەی سەروسەرەن دووربینەکەی چەم
پێشانی مەیلش بەزانوو بەردەن
تەعظیم جەناب پیریمش کەردەن
پیری خەڵقەسان خەم پەنەم وەردەن
پەی دەرگای عەدەم ئامادەم کەردەن

***

(خاڵ) دوای ڕوونکردنەوەی مانای بەیتەکان و شێوەی ئیبداعیان دەفەرموێ: (یەکێك ئەگەر بەووردی دیوانی مەولەوی بخوێنێتەوە، وەتۆزێ شارەزا بێ، ئەزانێ کەمەولەوی شیعری وای زۆرە..). سەیری کتێبی (ناڵەی دەروون) بکە لە نووسینی خاڵ.[٤]

عبدالکریم مدرس دەڵێ: ( ئاخ مەولەوی ! خۆزگە بەو سۆزو عەشق و تێکۆشینەوە لە ولاتێکدا ئەبووی هەرچیت ئەنووسی وەرئەگێڕاو لە چاپ ئەدرا، تا جیهانی کوردستان ، بەڵکو هەموو جیهانی موسڵمانان بە تەئلیفات و ئاسارو ئەشعارت ڕووناك ببوایەتەوە، تا هەموو دنیا بیزانیایە بێشەی کوردستان چ جۆرە شێرێکی تێدا بووە..) . سەیری یادی مەردان ل : ٣٦٩ بکە.

* ئەم شیعرانە لەچەند قەصیدەیەکدان و ، لەیەك قەصیدەدا نین.

[٤] شێخ محەممەدی خاڵ کوڕەزای شێخ ئەمینی (خاڵ) ە لەسەرەتای دروست بوونی سلێمانی یەوە نیشتەجێی ئەم شارەن، وەکو لە پێشەوە باس کرا لەنەوەی مەلا (ابوبکر) ی (مصنف) ەو لەگەڵ ئەژادی مەولەویدا لەم زاتە دا یەك دەگرنەوە.

منیش ئەڵێم: خۆزگە توانایماڵیم ببوایە و بمتوانیبایە هەموو کتێبخانەکانی کوردستانم بدیایە و دوای دۆزینەوەی شوێنەوارەکانی قەڵەمی مەولەوی بەو شێوەیەی دڵ و دەروون پێی خۆشە نووسینەکانی ئەو هەڵکەوتووەم بە چاپ بگەیاندایە. بەڵام فارس واتەنی: (دەست ما کوتاه خرما بر نخیل).

# مەولەویی زاناو پایەی بەرزی

مەولەوی وەك لە نووسراوەكانی و لەدەم و زبانی زانا دێرینەكانەوە دەردەكەوی یەكەم سەرهەڵقەی زنجیرەی عیلم و زانین بووە، یەكێك بووە، لەكەڵەزاناكانی ڕۆژگارانی سەردەمی خۆی، وەكو تاكەیەكێكی هەڵكەوتوو پە نجەی بۆ درێژكراوە، ئالأیەك بووە لەئالأ سەركەشەكانی كوردستان، لەهەموو گیروگرفتێكی زانستی ومەزهەبی و(فقهی) وكۆمەڵایەتی دا.. باوەڕپێكراو و جێی متمانەبووە، فتواكانی- بێگومان- ( فصل ا لخاتام ) و كۆتایی كا روبەڵگەی كپ كردن و دە لیلی كوژاندنەوەی هەموو ناكۆكی یەكی هەموو كۆڕێ بوون، لە هەموو زانستەكانی عەقلی ونەقلی وفەلسەفەو مەنطیق و بەیان وتەفسیرو ئوصول و فروعدا خاوەن پلەوپایەی بەرزو بڵند بووە، لە (ا صول الفقه ) و ( كەلام ) دا -وەك ئاشكرایە- مامۆستای مامۆستایان بووە.

دانراوەكانی بەعەرەبی و كوردی و فارسی لە پانتایی كوردستاندا لەبەر بەرزی یان پە نجەیان بۆ ڕاكێشكراوە، بەدەیان و بەڵكو بە سەدان نوسخەیان لەبەر گیراوەتەوە، لە حوجرەكاندا وەكو بەرنامەی هەمیشەیی بەدەرس خوێند راون.

زانستی (كەلام ) پەیوەندی بە عاقیدەو بیرو باوەڕەوە، لەبەر ئەوە ئەم زانستە زۆر قوڵ و بەدەرەتانە و بەربڵاوە، زۆر بیروڕای كەچ و جیاوازو ئاژاوەی فكریی تیادا پەیدا بووە، سەری كێشاوە بۆ لادان و گومڕایی تێكدانی بیرو هۆشی باوەڕداران، ڕابەرانی ( شیعە ) و ( سوننی ) بواریان دا بێ باوەڕان سەرهەڵدەن، مەولەویش ویستوویەتی لەگۆشەی باوەڕەوە خزمەتی گەلانی كورد و عەرەب و فارس بكا و ڕا نمایی یان بكا بۆ ڕێگای ڕاست و مەبەستی دروستیان بۆ دەستنیشان بكات.

دانراوەكانی ئەمانەن :

یەكەم: ( عەقیدە مەرزییە ) كەی ، بریتی یە لە( ٢٤٤٠ ) بەیت، بەزمان كوردی جافی شارەزوور و ناوچەی تاوەگۆزیی خۆیان دایڕشتووە، لە ساڵی ( ١٢٨٠-ك ) دەستی پێ كردوومو لە ساڵی( ١٢٨١-ك ) تەواوی كردووە.

دووەم ( فواتح ): بەزمانی فارسی داینـاوە، ژمارەی بەیتەکانی لەهەزار بەیت بـالاتـرە. ئەم دوو کتێبەی سەرەوە لەلایەن ( شێخ محی الدین –صبری ) ( کانی مشکانی ) یەوە لەسالی ( ١٩٣٢-ز ) لە میسر- قـاهیرە- لەچاپ دراوە.[٥]

سێ یەم: ( فضیلة ) بەعەرەبی دانراوە، ژمارەی بەیتەکانی ( ٢٠٣١ ) بەیتە، لەسالی( ١٢٨٥-ك ) داینـاوەو، لەسالی ( ١٩٧٢-ك ) لەلایەن مامۆستا ( عبدالکریم مدرس )ەوە لە چاپ دراوە، هەر لەلایەن ( عبدالکریم مدرس ) ەوە شەرحێکی دوورو درێژی لێ کراوە.

لە ( یادی مەردان ) دا دەڵێ: مەولەوی کتێبی تری داناوە بەلام نەماون، وەك: ( خاطرات-خـاترات ) کەلە ژیانی خودی مەولەوی ئەدوێ.

-کتێبی ( رابطه ) ئەم کتێبە لە ڕابیتەی ( تصوف ) ئەدوێ- ئەمانە هیچیان شوێنەواریان نەماوە.

مەولەوی و( تصوف )

مەولەوی دوای پێوانی ڕێگای سەختی فەقێتی، توانی بەسەرکەتوانە- پـاش مـاندووبوونێکی زۆر- بـابەتە زانستییە جۆربەجۆرەکانی ئەو سەردەمە تەواو بکاو، بە تێگەیشتن و بە قووڵی و بەووردی، پلە بە پلە وبابەت بەبابەت بەوپەڕی وریایی و کارامەیی یەوە هێنـانیە کۆتـایی و گەیشتە قۆنـاخی دووەم و، هەوارگەی مەلایەتی، دەورەی وەرگرتن تەواو بوو، سەرەهـاتە سەر دەورەی بەخشین و بلاوکردنەوەی عیلم و زانست و پەروەردەو ئەدەب..

بۆ بەدی هێنـانی ئەم مەبەستەی دێی( هانەسوورە ) ی کرد بە نشینگەی و، تیـایدا بەگەرمی و بە دڵسۆزی و چالاکانە نـاوی خوای هێنـا و زانستگەیەکی پێکەوە نـاو، دەستی کرد بە( تدریس ) و وانە وتنەوەو پیاچونەوەی بـابەتەکانی، لە دواییدا- لەبەرهەر هۆیەك بووبێ – لە( هانە سوورە ) نـامێنێ ودەگوێزێتەوە بۆ گوندی ( چروستـانە ) .

لەم قۆنـاخەدا وەکو پێویستێکی ژیان بەلای دنیای ژیـانەوە نـاوڕێکی دایەوەو، کەرەستەی ژیـانی پێکەوە نـاو ژنی هێنـا، تـاڕادەیەك لەوێدا و لەو کاتەدا تۆزێ حەسایەوە.

لێرەداو لەم قۆنـاخەدا ئەندێشەیەکی دەماخ تەزێن هـات بە مێشکیداو هەڵوێستێکی شێوە دوو دڵی و گومانی خستە سەرچاوەی بیریەوە، دۆش داماو سەرگەردانی بەبێ بەزیی یانە گەما ڕۆی دڵی داو بەسەریا زاڵ بوون، پەیتا پەیتا بەبێ ڕەوینەوە زمانی دەروونی و حاڵی دەیگووت:

---

[٥] ( کانی مشکانی ) : گوندێکە کەوتۆتە لای خوارووی شاری ( سنە ) وە، ئەم ( شێخ محی الدین )ە لەبنەماڵەی شێخانی مەردۆخە، بەنـاوی فەقێتی یەوە دەچێ بۆ ولاتـان و لەئەنجامدا لەشاری قـاهیرە- لە ( میسر ) نیشتە جێ دەبێ، وەبەکاری چاپەمەنی یەوە خۆی دەژێنێ ، وەلەوێش کۆچی دوایی دەکا. ( زکریا محی الدین صبری ) کوڕی ئەوەو ئێستا لە ژیـاندا یە.

ئایا ( تدریس ) بەتەنیا دەبێ بەزامنی بە خوا گەیشتن؟، ئایا بەکاری ئامۆژگاری ودەمەتەقێ کردن لەگەڵ بەگ و بۆر و پیاو چاکان و بۆخوا گونجاوان و لەرێگای کۆمەڵایەتی و ئەدەبەوە ڕاستەوخۆ دەتوانم بگەمە پلەی تەقواو خواناسین؟،

ئایا بۆ گەیشتن بەم ئاواتە پیرۆزە دەتوانم لە ڕێگای ( تصوف ) ەوە بەدڵنیایی بیگەمێ و تیایدا بحەسێمەوە؟

ماوەیەکی زۆر بە قووڵی و بەم ئەندێشە دەروونیانەو لەگەردوونی بیرو خەیاڵیدا دەسوڕایەوە. تا لەئەنجامدا بە دڵنیایی ڕێگای ( تصوف ) ی گرتە بەر و دەستی ئاڵان بەچاکی شێخ عوسمانی تەوێڵەییداو بوو بە ڕێزە خوانی..[٦]

ئەمەش پاش تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی ڕەوشت و کردارەکانی ، گومانی لێی نەبووەو بەمەردی ئەو مەیدانەی زانیووە، وەکو پێویستە دەبێ بزانین، مەولەوی پیاوێکی سادەو ساکارو ساویلکەو نەزان نەبووە، کوێرانەو بەبێ بەڵگە ئەو ڕێگا سەخت و دیشوارەی نەگرتۆتە بەر یەکێك بووە لەکەڵە زاناو وشیارە بە ناوبانگەکانی سەردەمی خۆی و خاوەنی هۆش و گۆش و مەڵەوانی دەریای شەریعەت و ئایین بووە.

دەبێ ئەوەش نەخەینە پشت پەردەی لە بیر چوونەوەوە ( سراج الدین ) یش ( قدس سره )..وەك ئاشکرایە_ مەردێکی کارامەو شارەزاو هەڵکەوتوو بووە لە ڕۆژگارانی ئەو سەردەمەدا تاکە سواری مەیدانی ( تصوف ) بووە.

جێ نشینەکانی ئەوانەی کە مافی ئیرشادو ڕا نمایی یان دراوەتێ، لە زانست و ئایین پتەوی ڕەوشت و خوی بەرزیاندا ، لە ( وەرع ) و ( تەقواو ) کردار بێ گەردیاندا، لە ناوچە دوورو درێژەکانی دوورو نزیکی کوردستاندا پە نجەیان بۆ درێژ کراوە، دەیان وەکو پایەبەرزی عەللامەی بەناوبانگ مەلا ئەحمەدی نۆدشەیی و مەلا عەلیی قزڵجەیی و مەولەوی شاعیرمان و دەیان تر...کاسەلێس و پەروانەی چرای ڕووخساری ئەو بوون.

( سراج الدین ) ( خوالێی رازی بێ ) لە ژیانیدا هیچ جۆرە سامانێکی دنیایی کۆ نەکردۆتەوە، دارایی و سامانی دنیایی بریتی بووە لە تەقواو خواپەرستی و ڕابەرێتی یەکی دوور لە تەماع، هەموو

[٦] شێخ عوسمانی( سراج الدین ) ( ١١٩٥-١٢٨٣-ك ) ( قدس سره ) لەساڵی( ١٢٢٨-ك ) پاش چەند ساڵێك خوێندن ئیجازەی خەلافەت لە مەولانا خالید ( قدس سره ) وەردەگرێت، ماوەیەك بەفەرمانی مەولانای ڕابەری لە سلێمانی ئەمێنێتەوە، لە دواییدا لە دێی تەوێڵەی هەورامان بە یەکجاری نیشتەجێ دەبێ و، بە ئیرشادەوە خۆی خەریك ئەکا.

سامانی ئاشکرایی و نهێنی بریتی بووە لە بڵاوکردنەوەی زانست و خووی بەرزو یادی کردگار و خزمەتی موسڵمانان لە ڕێگای ( تصوف ) و ئایین و ڕەویەی کۆمەڵایەتی یەوە.

بە باوەڕی مەولەوی و زانایانی ئەوسەردەم ( سراج الدین ) یەکێك بووە لەو تاکە کەسانەی کەمەولەوی خۆی لەم سێ بەیتەی دواوەدا بە شان و باهوویاندا هەڵدەداو دەڵێ:

چەن کەس هەن دەرچوو لە دەس ئەفسانی
( مصفی ) لە ڕەنگ ( وصف ) ی ئینسانی
ئاروو دوور وجوود سۆزیاگ، ئەوێ
نییە لە لایان هیچ ڕۆژ و شەوێ
پێی دڵ لە زنجیر ( ماسیوا ) ( مطلق )
موشتاقی دیدار مەحبووبی بەر حەق [٧]

بەڵێ مەولەویی ڕەندو خواناس ، لە ژێر پەردەی ( تصوف ) دا بەهەستێکی پاك و بە نیازێکی بێ گەردەوە ویستی خۆی بگەیەنێ بە خواو، جیهانی ( ناسووت ) بە جێ بێڵێ و لە هەوارگەی جیهانی ( مەلەکووت ) دا نیشتەجێ و ئارام بگرێ، شەونخونی و شەوبێداریی کێشاو، لە تاریکایی شەوەزەنگ و تاریك و نوتەکداو، لەو کاتەدا کە سروەی غەیب دەیدا بە گوێیداو دەیگوت:

شەوەن ، خەڵوەتەن، ماڵ بێ ئەغیارەن
عالەم گرد وتەن، دۆس خەبەردارەن

خۆی لەکەمەن هاوێشتووەو بەچاوی ئەسریناوی وبەهەناسەی دووکەڵاوی یەوە ڕووەو بارەگای تەختی کردگار بەلارە ملی و گەردن کەچی و بە دڵ وریایی یەوە تاکو بای سەحەر داوێتی لە گۆشەی دەماخی دڵی دانیشتووەو خۆی خستۆتە ژێر چاودێری تەنیا و تاکەوە.

---

[٧] مانای ئەم سێ بەیتە : ( ئاروو، دوو؛ ئاگرو دوکەڵی وجوود. واتە : چەند کەس هەن لە دەسەڵاتی ئارەزوو خووی خراپی نەفس ڕزگاریان بەووە، ڕەنگ و مۆرکی لایەنە جانەوەری یەکەی لێ بۆتەوەو جگەلە ئاگروو دوکەڵی وجودی سووتاویان شەو وڕۆژ هیچی تریان لا نی یە، پێی دڵیان لە زنجیرو کۆتی شتانی جگەلە خودا ئازادەو تەنها دڵیان بەستە هەر بە خوداوە، هەر ئارەزوو مەندی دیداری ئەون. )
هەڵبژاردەیەك لە ( عەقیدەی مەرزی یەی ) مەولەوی، دانراوی خۆشەویستم بابا عەلی شێخ عومەری قەرەداغی، چاپخانەی ئیرشاد بەغداد ، ( ١٩٨٥ ــز ).

مەولەوی –وەکو سۆفی- شەیداو عاشق بە( جەمال ) و ( جەلال ) ەو شارەزای ڕێگای دڵداری یە، بە خۆدەرخستنی و بەخۆشاردنەوەی کۆڵ ناداو لە هەموو حاڵێکدا دڵەکەی نیشانەیە بۆ تیری پەرداری بە ناز یا بە عیتاب.

مەولەوی وەکو زانایەکی دڵ ئاوەدان، وەك، سۆفی یەکی ڕاست ڕەوی خواناس لای وایە دنیاو ژیان ( هۆیە ) و ( ئەنجام ) نییە، بەختەوەری و کامەرانی زادەی ژیانێکی ترەو هێشتا لە دایك نەبووە، لەم ژیانەدا ڕەنج کێشان و هەوڵدان و ئازارچێشتن، لەوی تریاندا حەسانەوەو ئارامی و بەرامبەر بە یار دانیشتن ( والی ربها نا ظره ) صدق الله العظیم. وەکو سەرچاوەی ( نبوة ) دەفەرموێ: ( الدنیا مزرعه العقبی ) ، واتە ئەم دنیا کێڵگەی چاندن و کشتکاری و درەو ودەسکەنە...و خۆ ماندوو کردنە، ئەو دنیاش حەسانەوەو خەرمان هەڵگرتن.

بەڵێ بەم شێوەیە مەولەوی زاناو بلیمەت، مەولەویی شاعیرو ئەهەنگی دەریای ئەدەب، مەولەویی سەرچاوەی ( حیکمەت ) و( فەلسەفە )و ( کەلام ) ... لەبەردەمی شێخ عوسماندا چۆکی داداو بوو بە شاگردی.

# پلەو پایەی (تصوف) ی مەولەوی

(تصوف) جیهانێکی ئاسۆ فراوان و نهێنی یە، تیژیی بیرو ژیرییە تیشکی بینایی نایگاتێ و دوورە لەئیدراکەوە، لە توانای کەسدا نی یە لە ڕێگای ئەزموون و (حەواسە) مەوە پلەو پایەی دانیشتوانی ئەو جیهانە نادیارە دیاری بکا و بی پێوێ، لە بەر ئەوە بۆمان نییە پلەو پایەی (تصوف) ی مەولەوی و ڕوتبەی ڕابەرەکەی-لە ڕووی بەرزی و نزمی و تاریکی و ڕوونییەوە- دیاری بکەین، بەڵام بۆمان هەیە بپرسین:

ئایا مورید دەتوانێ لە ئەنجامی تێکۆشان وخۆ بەخکردندا ڕابەرەکەی بەحێ بهێڵێ و پلەو پایەی لە شێخەکەی بالاتر بێ؟ . بە بۆچونی من ئەم بەجێ هێشتنە (شرعا و عقلا و عرفا..) ڕەوایەو جێی گومان نییە، ئاشکرایە مەولەوی و (سراج الدین) لەم یاسایە بەدەر نین و بەرزی یەکێکیان و نزمیی ئەوی تریان دیار ناکرێن، پرسیارێك لێرەدا سەر هەڵئەداو ئەمەیە:

مەولەوی لە شیعرەکانیدا بەرامبەر بە پیری ، خۆی دەخاتە پلەی نزمەوەو هەمیشە داوای لێ ئەکا (کشتە) کەی ڕووزەرد نەبێ و بیاڵەکەی پڕ بکا لەمەی و..لە پلەی سەختدا دەستی بگرێ... ئەمەش ئاشکرایە نابێ بەبەڵگەی گەورەیی پیر بە موتڵەقی، وەیا بەنچوکی و نزمیی پایەی مەولەوی دیسان بە موتڵەقی، چونکە مەولەوی بە درێژایی تەمەنی نەك بەرامبەر بە شێخی ڕابەری ، بەڵکو بەرامبەر هەموو هاوڕێ یەکی گەورەو بچووك خۆی زۆر نزم کردۆتەوە، خۆ هەڵکێشان و لە خۆ بایی بوونی بەلاوە ئەنگ بووە، هەرگیز لە هەڵبەست وشیعردا لەگەڵ ئەو ئیبداع و شاکاری یەیاندا خۆی بەرز نەکردۆتەوە، دیارە لە (تصوف) یشدا هەمان ڕێگای پێواوەو لافی سەربەخۆیی لێ ئەداوەو (حب الظهور) ی پێ ناخۆش بووە.

بەڵام جێی گومان نییە مەولەوی لە پلەی زانست و نوسین و ئەدەبدا زۆر لە شێخەکەی بالاترو زاناتر بووە، لەوانەشە لە شێخی ڕابەری زیاتر خۆی بە خوا ڕەنجاندبێ و زۆرتر هەوڵی دابێ و تێکۆشابێ، کەواتە دوور نییە لەلای خوا لە شێخی ڕابەری بالاترو گەورەتر نەبێ ، وەیا هیچ نەبێ یەکسان بن.

بەم پێ یە، سەردانەواندنی مەولەوی لە شیعرەکانیدا بۆ شێخەکەی جۆرێکە لەکوشتنی هەوای ئەفس و شکاندنی ئارەزووی و ڕەمزە بۆ ڕێزگرتنی ڕابەرەکەی چونکە (تصوف) سەرتا پای بریتی یە لەئەدەب و ئەخلاق.

بەڵام بە ڕای مەولەوی ڕابەرەکەی گەیشتۆتە پلەی بەرزی (تصوف) . هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی پاکیان و لە کرداری چاکیان.

# مەولەوی و هەستی نەتەوایەتی

پێش چوونە ناو ناخ و قوڵایی باسەکەوە راستی یەك وەیا دیاردەیەك هەیە پێویستە لەڕێگای خامەوە پێشانی خوێنەرانی بدەین کەئەمەیە:

ڕێبازی نەتەوایەتی لەسەردەمی مەولەوی و پێش مەولەویشدا، نەك بڵێم هەر لەناوچەکەی مەولەویدا بەتەنیا سەری هەڵنەدابوو، بەڵکو لەهەموو ناوچە فراوانەکانی ئەردەڵان و بابانیشدا بەمەفهوومی زیندووی ئێستامان زادەی هیچ بیرو مێشکێك نەبوو، خاك و،ئاو، نیشتمان، گەل، زمان... بەپارسەنگی ئەو ڕۆژە بەتەسکترین شێوە دەهات بەبیرو هۆش و خەیاڵدا، نیشتمان بریتی بوو لەو پارچەزەوی یەی کە تیایدا دەهاتە دنیایەوە.

نەخشەو فەرهەنگی بروخەیاڵی ئەو سەردەمانە جگە لەبابەتەکانی وەك شیعەو سوننی و قادری و نەقشی و، جگەلەهەندێ بیرو ڕای وشك و تەسکی خێڵایەتی هیچی تری تیادا نەقش نەکرابوو.خوێندنەوەی داستانی ڕۆستەم وزۆراب و حیکایەتی شیرین و فەرهاد.. شەوچەرەی هەموو کۆڕو کۆمەڵێك بوو، سێبەرێك جگە لەتەکیەو خانەقا و دیوەخان و کۆمار.. بەو لاوە نەبوو، ڕوانگەیەك نەبوو لەئاسۆیەوە، وەیا لەگۆشەیەکیەوە چاو باڵ هەڵدا بۆ جیهانێکی کراوەترو بۆ دیمەنێکی ڕووناکتر وە یا تاریکتر..

پاشا وخان و سان و بەگ و میران و شێخان.. لەپەنجەرەی بەرژەوەندیی خۆیانەوە بە ئیلهامی ئارەزووی کەسی و تاکی و، لە پێناوی قازانجی خۆیەتی و خێڵایەتیدا نەخشەیان بۆ ئەکێشان و مەبەستیان بۆ دەستنیشان دەکردن.

ئەمەش- ئاشکرایە- بەپێی زرووف و یاسای کۆمەڵایەتی دەبێ بە قۆناخێك لە قۆناغەکانی لە قۆناخەکانی ژیان، لادان لێی و گۆڕینی بەندە بە هاتنی قۆناغێکی کەوە.

هەموو بیرو خەیاڵێك زادەی ڕۆژێکی تایبەت و ڕەنگدانەوەی نەریتێکی کاتە، نەشوێن تەی ئەکاو نە کات ئەبڕێ و نەبەرەو دواش دەگەڕێتەوە.

مەڵبەندەکەی مەولەوی لەژیانێکی گۆشە گیریدا دەژیان و نەبەسترابووبە وڵاتێکی ترەوە ، بگرە لەناو خۆشیاندا لەیەکتری بێ ئاگا بوون، مەودای هات و چۆ لەوپەڕی تەسکیدا بوون، لەڕێگای دەماودەمەوە هەواڵ و دەنگ و باس لەشوێنێکەوە دەگوێزرایەوە بۆ شوێنێکی تر، هەژاری کوێرەوەریی باری ئابووریش با بوەستێت، بە هۆی ڕەقەنی و

وشكی و سەختیی ناوچەکەیان نەشیاویی نەگونجاویی بۆ کشت و کاڵ و، هەژاری وکوێرەوەری بەشێك بوو لە ژیانیان.
ئێمەی ئەدەب دۆست و نیشتمان پەروەر ئەگەر بە پێوانەی پێوەری ئەمڕۆمان جوڵانەوەی ژیانی ڕابردوومان بپێوین و هەڵی سەنگێنین بێ گومان دەکەوینە هەڵەی گەورەوە.
لەو ڕۆژگارانەدا و پێشتریش بیروباوەڕی نەتەوەتی لە مێشك و لەدەروونداتۆمار نەکراوەو نەبووە بە دروشمێکی ڕەگەزی و پێوەی ببەسترێن، وەکو ئەمڕۆی ئەم سەردەمە هیچ نەتەوەیەك نەخشەی وڵاتەکەی نەخراوەتە ناو چوارچێوەی سنووردارەوە جگە لە بیروباوەڕ ئاینی ئەویش لەهەندێ بواردا بەتێگەیشتنێکی تەسك و وشك و کورت بینی شتێکی تر بەولاوە نەبوو.
بۆ نموونە: لەڕۆژانی کۆندا ناو بەناو سەدان کورد هەر یەکەیان لە ژێر ناوێك و هۆیەکی تایبەتدا دەچوو لە وڵاتانی دیکە نیشتەجێ دەبوون، جگە لە دروشمی ئانی هەموو دروشم و ناونیشانی کوردایەتی و کوردەوارەکەی فەرامۆش ئەکرد، بەبێ ئەوە یاسایەك بووبێ لەم کارەی بەرگری لێ بکات.
زۆرمان هەیە کۆچیان کردووەو لەوڵاتانی تر نیشتەجێ بوون و بەدرێژایی ساڵ نەوەکانیان نەژادی خۆیانیان لە بیر چۆتەوە، وەیا لە بیری خۆیانیان بردۆتەوە.
کەواتە لە پەنای ئەم نەرێتی و بیرو باوەڕەدا نابێ گلەیی لە پیاوانی دێرینەمان بکەین و توانجیان تێ بگرین کە بۆ بەکارێك هەڵنەستاون کەزادەی بیرو مێشکی دەیان ساڵەی دوای خۆیانە.
لێرەدا پرسیارێك سەر هەڵئەدا ، ئەویش ئەمەیە:
بۆ(حاجی قادری) نیشتمان پەروەری بەناوبانگ، لەهەمان چەرخ و ڕۆژدا ژیاوەو، لەهەمان کاتدا شیعری نیشتمانی زۆرەو، لەتەقالیدی کۆن لایداوە؟.
پێش ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە، پێشەکی پێویستە چەند شتێك هەیە بیزانین کوردستانی سەردەمی عوسمانی لەڕووی وشیاری و وورییایی یەوە گەلێ لە کوردستانەکەی مەولەوی جیاوازتر بوو، کوردستانی عوسمانی بەهۆی ئەم چەند خاڵانەی خوارەوە بزوتنەوەی نەتەوایەتی لەناخیاندا چەکەرەی کردبوو، ئامادەیی خۆیی یان لە دەروونیاندا پەیدا بوو بوو:

نزيك بوونيان بە جيهانى ئەورووپاو سوود وەرگرتنيان لە جولآنەوەكانيان.
بوونى چەند نەتەوەيەك بەرەگەز جياواز – وەك تورك و كورد و ئەرمەن– لەيەك شوێن و لەيەك ولآتدا.
پەيدا بوونى چەند بيرو باوەڕێكى ڕەگەز پەرستى و نامرۆڤايەتى و دژ بەمافى كەمايەتەكانى سەر بەدەوڵەتى عوسمانى.
بوونى چەند ئاينێكى جياوازو سەرەكى لەناوياندا، وەك ئيسلام و مەسيحى و جوولەكە.
دەست خستنە ناو كاروبارى ولآتەوە لەلايەن دەوڵەتە ئيستعمارەكانەوە.
پەيدا بوونى پارتى (ترقى واتحاد) كەلايان وابوو ڕەگەزى تورك لەهەموو ڕەگەزێكى تر بالآترە، بەم ڕەگەز پەرستەيان لەناوەڕۆك و بنەڕەتەكانى خەلافەتى ئيسلامى لايان دابوو.
ئەم هۆيانە كاريان كردە سەر دانيشتوانى كوردستانى عوسمانى و بوون بەهۆى ڕاپەڕين و هەستان بە شۆڕش، بەلآم كوردستانى مەولەوى ئەو هۆيانەى تێدا پەيدا نەبوو بوو.
بوونى ئەو توخمانە كەباس كران كاريان كردبووە سەر بليمەتێكى وەك حاجى قادرو ميللەتەكەى، حاجى كە هاوچەرخى مەولەوى بووە بەچاوى خۆى توركياى كاتى عوسمانى دووەو، بە گوێى خۆى ئەو ئاوازو نەغمانەى بيستووەو، بە بيرى خۆى و بە پێوانەى هەستى گەشى هەڵىسەنگاندوون، گەيشتۆتە قەناعەتێك كە پێويستە گەلى كورد ژيانى خۆى بكۆڕێ و ئاسۆى بيرى فراوانتر بكا.
ئايا ژيانى مەولەوى و كوردستانەكەى يەكسانە بە ژيانى حاجى و كوردستانەكەى ؟ ، ئەمانە و وێنەيان هەر يەكەيان لەگۆشەيەكەوە بليمەتى يان دەردەكەوێت.
لەبەر نەبوونى ئەو هۆيانەى كە پێشتر باسكران، لەسەردەمى مەولەوى و كوردستانەكەيدا وشەى نيشتمان، كورد، هۆز.. بەمانايەكى تەسك بەكار دەهات و لەبەرژەوەنديى تاكى بەولاوە بە شێوەيەكى وەك ئەمڕۆمان بەكار نەهاتووە.
ياخى بوونى سەرەك خێڵەكان و ڕاپەڕينەكانيان لەهەستى نەتەوايەتەوە دوور بووە، بەئارەزووى تاكى و كەسى شۆڕشيان بەرپائەكرد، وەبەسەدان ..كەس خوێنيان دەڕژاو لەئەنجامدا بەخەلآت و.. فەرمانێك ڕاپەڕينەكەى دەكوژايەوە، وەيا بە خيانەتى لايەكيان بەرامبەر بەلايەكى تريان دەهاتە كۆتايى.

ئایا بابانەکان و ئەردەڵانی یەکان بە بیریاندا دەهات چوارچێوەیەکی سیاسی و ئابوری بۆ کورد دروست بکەن؟

سەرەتای بزوتنەوەی نەتەوایەتی لەو سەردەمانەو لەم وڵاتانەدا دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای ئەم چەرخەو هاتنی دەوڵەتە داگیرکارەکانی بێگانە ، هەتا ئەم خوێن مژانە لەئارادا نەبوون و وڵاتیان داگیرنەکردبوو بارودۆخی وڵات بە ئاسایش و خۆشی دەڕۆیی و کوشتن و بڕین و چەوساندنەوەو ڕەگەزپەرستی ناویان نەبوو، ئیتر بۆ دەبێ ئێمە بە بێ وشیاری شاعیرەکانمان تاوان باربکەین و گیانی پاکیان لە توێی کفن و گۆڕدا داچڵەکینین؟ یا تیری تانەو تەشەر بگرینە ئەردەڵانەکان و بابانەکان؟

با ناوی کەڵە شاعیرێکی تری وەك (نالی) ی نەمر بهێنینە گۆڕێ و لەم ڕووەوە لێی بدوێین و، لەتەك مەولەویدا لەیەك تەرازوو دا بەرامبەریان بکەین و هەڵیان سەنگێنین:

بە پێوەری باوەڕی ئەمڕۆمان بێ، هەرگیز ناتوانین بڵێین (نالی) ی سەر تۆپ و لوتکە شاعیرێکی نیشتمانی بووە، کەواتە بەووتەی کۆتا بینان بێ (نالی) و مەولەوی نرخیان بۆ دانانرێ، چونکە بەنیشتماندا هەڵیان نەداوەو شیعری وەتەنییان نەوتووە.

قەصیدە بەناوبانگەکەی کە بۆ (سالم) ی شاعیری ناردووەو، تیایدا باسی حوجرەکەی و سەرچنارو دەشتی فەێکان و شاری شارەزوور و(خاك وخۆڵ) دەکا، وەیا باسی ستەمی تورکەکان و دەروون تاریکییان ئەکا، وەیا بۆ نەمانی بابانەکان هەناسەی سارد هەڵدەکێشێ... لەگەڵ ئەوەشدا کە گڕ بەر ئەداتە دڵ و دەروونی خوێنەران، هێشتا بە پێوانەی ئەمڕۆ بێ ئەو قەصیدەیەو قەصیدەکانی تری کە بۆ نیشتمان پەروەری یان لێوە دێ، نامان گەیەنێتە ئەو قەناعەتەکە بڵێین (نالی) شاعیرێکی نیشتمانی بووە هچ کاتێك (نالی) ی نەمر بەخەیاڵیدا نەهاتووە کەگەلی کورد پێویستە خۆی خۆی بەرێ بەرێوەو خاوەنی قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆ بێ، ئەو هەست و سۆزەی کەلە قەصیدەکەی (سالم) داو ئەوانی تریدا دەریان دەبڕێ، پاڵپێوەنەرەکەی جگە لە هەستی کەسی و لەدووریی شارەکەی و دۆست و برادەرەکانی شتێکی تر نە.

هەستەکەی نالی لە قەصیدەکانیدا کەبەهەستی نەتەوایەتی دەدرێ لەقەڵەم، هەر هەمان هەستە کە حافزی شیرازی و سەعدی شیرازی پێش(٧٠٠) ساڵ دەریان بریوە.

**به پێی وتەی (کل امور مرهونة بأوقاتها) ، وەبەپێی ئەوەی لەمەوپێش وتمان هەموو شاعیرێك مێشك و خەیاڵی زادەی کاتێکی تایبەتەو لە سنووری پێوانەی ڕۆژەکەی خۆی تێ ناپەڕێ.**

**ئیتر با نە مەولەوی و نە نالی و... نەگەورە پیاوانی کورد گوناهبار بکەین و، نەلەپلەو پایەیان کەم بکەینەوە، ئەگەر بەووردی لە هۆیەکان بکۆڵینەوە بە جوانی بۆمان دەردەکەوێ نەڕەش و ڕووتەکان بە گشتی گێژو گەمژە و مێشك پووچ بوون، وەنەهەموو بەگ وسانان و خانان.. نیشتمان فرۆش و خان بوون، وەنە شاعیرانمان کۆنەپەرست و سفرە دڕ بوون.**

## مەولەوی و نووسینی هەورامی

**مەولەوی – وەکو چوار پشتی پێش خۆی– زادەو پەروەردەی ناوچەی تاوەگۆزو لەوێش ژیاوە ، ئەم ناوچەیەش بەزاراوەی جافی جوانڕۆیی ئەدوێن و لەزاراوەی کوردیی هەورامی ناگەن.**

**لێرەدا ئەم پرسیارە سەر هەڵئەدا: بۆ مەولەوی بەزاراوەی هەورامی هەڵبەست و شیعری داناوە؟. وەك ئاشکرایە . بەڵگەی ناوێ لەو سەردەمەدا زاراوەی هەورامی لە مەیدان و بواری شیعردا بەسەر زۆربەی ناوچەکانی دەووروبەر و نزیکیدا زاڵ بووە شاعیرەکانی سنەو سەقزو بانەو مەریوان و شارەزوور وکۆماسی...بەزاراوەی هەورامی شیعر و هەڵبەستیان هۆنیوەتەوە. وەك شێخ حەسەنی مەولاناو ئەحمەد بەگی کۆماسی و حەمەغای دەربەند فەقرەو دەیانی تر، بەمەرجێ ئەمانە هیچیان هەورامی نین.**

**ئەو سەردەمانە کە هەورامی بە شیعرو هۆنراوەوە ئاشنا بوون، ناوچەکانی تری کوردەواری لەم جۆرە ڕۆشنبیرییەوە دوور بوون. ئەمەش دیارە ئەوە ئەگەیەنێ هەورامی بە پێی شوێنەواری جوگرافی یان و، ئاوو هەواو شوێنەکەیان لەمەیداندا گوێ پێشکەوتنیان بردۆتەوەو، بێگانە پەرستی یان لانەبووە.**

**با ئەوەشمان لەبیر نەچێتەوە زاراوەی هەورامی بو کێش و وەزن و مەفرەداتی شیعرو هەڵبەست لەزاراوەکانی تری کوردی زۆر بە چێژو بە هێزترەو، خاوەنی ووزەو توانایەکی تایبەتەو لەوانی تردا نیە.**

هەندێ کەسان لە رووی شارەزایی و نەزانینیانەوە لایان وایە مەولەوی بۆیە بە هەورامی شیعری ووتووە، لەبەر ئەوە خەلیفەی شێخ عوسمان بووەو، خۆشەویستیی ئەو بەرەوئەو زاراوەیە ڕای کێشاوە، لە کاتێکدا پێش ئەوەی شێخ عوسمان بناسێت و ئاشنایی لەگەڵیدا پەیدا بکات هەموو نووسینی شیعرەکانی بەهەورامی بووە.

زۆربەی هەڵبەستەکانی لەسەردەمی فەقێتیدا بووە، لەبانەوە پارچە شیعرە بەناوبانگەکەی نووسیوە بۆ شێخ عەزیزی جانەوەرەیی کەلە شاری سنە تووشی دەردی ئاوڵە بووە، لەگەڵ شێخ یوسفی نۆتشەدا لەکاتی فەقێتیدا پێکەوە لەشاخەکانی (پاوە) و(خانەگا) ڕاویان کردووە. بەم هۆیەوە لە شاری سنەوە نامە هەڵبەستەشاکارەکەی دەنێرێ بۆ شێخ یوسف.

# مەولەوی و ئەم ئەندازە شیعرە

شاعیرێکی هەڵکەوتووی وەك مەولەوی کەپتر لەحەوت گرێ ژیاوە، دیارە ژمارەی قەصیدەکانی لەم دیوانە زیاترن، بەهۆی سوتانی کتێبخانەکەی لەسەردەمی خۆیدا زۆر نووسراو و هەڵبەستی پێوە سووتاوە، دەماو دەم و لە پیاوانی دێرنە ساڵ وتەمەن درێژ بیستراوە و بیستوومە کەمەولەوی هەر پارچە شیعرێکی بۆ هاتبێ و هەر پارچە شیعرێکی بۆ یەکێك ناردبێ، هەردووکیانی لەگەڵ موناسەبەو ناوەکانیاندا تۆمار کردووە.

ئەم ئەندازە شیعرانەش کەلەبەردەستدایە، مەرج نیە هەمووی دانراوی مەولەوی بێ، زۆر قەصیدەی هەیە لەلایەن نووسخە نوسانیەوە بەنەزانین دەستکاریان کردوون، زۆر چامە لە نوسخەیەکدا بۆ یەکێکەو لە نووسخەیەکی کەدا بۆ یەکێکی ترەو لەو کەمترە وەیا زیاترە، لەهەندێکدا چامەیەك هەیە بۆ دۆستێکەو، لە یەکێکی تردا هەمان چامە دوانە و بۆ دوو کەسە.

هەموو دانە دانەی بەیتەکان مەرج نە لە شێوەی ئیبداعدا بکەوێتە بەرچاو هۆی جیاوازیی نوسخە دەست نووسەکان بە زۆری دەگەڕێتەوە بۆ شێوەی ئیملای کۆن لەهەموو ناوچەکانی کوردستانی ئەردەڵاندا دیوان و شوێنەواری خامەی مەولەوی زۆرەو بەداخەوە (دەستی ئێمە کورتەو خورماش بەسەرداری خورمای بەرزەوەیە).

خۆزگە خێرخواهان بە پیاوەتی ئەو دیوان و شوێنەوارەیان بۆ ئەناردم.

## کەی و کێ لەقەبی (مەولەوی) ی دایە؟

شاعیرمان خوای لێ ی ڕازی بێ خۆی لە بووندا بە نەبوو دادەنێ و، لای وایە لەم بوونەدا ئەندامێکی بێ کەڵکەو نەیتوانیوە تیایدا کەلێنێکی مرۆڤایەتی پڕ بکاتەوە، بۆیە لە ڕووی شکاندنی نەفس و (نسیان الذات) ەوە نازناوی (مەعدوم) ی هەڵبژاردووە بۆ خۆی.
بەڵام وشەی مەولەوی وەك لەتەمەن درێژودێنە ساڵانم بیستووە لەسەردەمی فەقێتیدا لەشاری (سنە)ی پایتەختی ئەردەڵان لەلایەن (غوڵام شاخان) ی والیی ئەردەڵانەوە وشەی (مەولەوی) ی بڕا بەسەریا و بەم ناوەوە لەناو گشتیی خەڵکدا ناسرا، (حوجرە)ی ژمارە نۆزدە کە ژوورێکە لەژوورەکانی مزگەوتی (دار الاحسان) ئێستاش بەناوی (حوجرەی مەولەوی) یەوە ناوبراوە، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە شاعیرمان لەسەردەمی گەنجی و فەقێتیدا هەڵکەوتوو دیارو پایەو پلەی کۆمەڵایەتیی وشاعیرێتی بەرز بووە، بڕوایان وابووە مەولەوی مەولاو میری شاعیرانەو شیاوی ئەو لەقەبەیە.
مامۆستا (عەلادین سەجادی) لای وایە کەس و کارو خزمەکانی عەنبەر خاتوونی خیزانی کەلە وڵاتی (ئەفغان) ەوە هاتبوون لەقەبی (مەولەوی) یان داوەتێ. بەڵام ئەم بۆ چوونە ناچەسپێ و جێی باوەڕنیە.

## هۆی بڵاوبوونەوەی شیعری مەولەوی

جێی گومان و دوودڵی نە لەکارو باری کۆمەڵایەتی و لەئیبداعی شیعرو شاکاریدا هاوتای کەم بووە، لەهەموو شایی و شیوەندا -بەپێی توانای لە کوردستانی ئەردەڵان و باباندا- بەچوونی خۆی، وەیا بەنامە هاوبەشی کردوون، فەقێ بەناوی خوێندنەوە لەناوچە دوورەکانەوە هاتوون بۆ قوتابخانەکەی دەرسی یان لاخوێندووە، ناو بەناو لەژێر پەردەی (تصوف) دا بۆ گوڵ چنین و خەرمان لۆخی چووە بۆ تەویڵەو بە هەفتە و بە مانگ تیایدا ماوەتەوە، لەوێدا دەیان شاعیرو زاناو سەدان بلیمەت و مەلەوانی دەریای مەعنای ی دیوەو لەگەڵیاندا دواوە و لەهەموو بابەتەکانی ئەدەبی و زانستی فیقهی و کەلامی و حیکمەت و فەلسەفەوە..بیریان گۆڕیوەتەوە و ئاڵ و گۆڕی ڕۆشنبیریان کردووە، ئەمانەش هەر یەکەیان لەوڵاتێکەوە هاتوون و، ئەجامی بیری قوڵ و ووردی و ناسکی خەیاڵی مەولەوی یان گەیاندووە بە هەرێمەکانی خۆیان.

ئەم هۆیانەو كۆبونەوەیان لە مێشكی مەولەویدا كاریان كردۆتە سەر هەموو زانایان و شاعیران و سەرۆك هۆزان..

پەیوەندی بە شاكانی ئێران و والیەكانی ئەردەڵان و پاشاكانی باباندا زۆر بە تین و هەمیشەیی بووە، لە هەموو هەرێمێكەوە هەستیاران ئەدەب دۆستان نامەیان بۆ ناردووە، بەو هیوایەی مەولەوی بە خەیاڵە ناسكەكەی و بە هەستە تەڕو بڕە ئاودارەكەی وەڵامیان بداتەوە، مەولەوی بە هێزی خامەو بە نامەی بە پێزی توانیویێتی كاریان تێ بكا و دڵ و دەروونیان بكڕێ سەرنجیان بەرەو خۆی ڕابكێشێ.

لەگەڵ بەگزادەكانی جافدا بە تایبەت مەحموود پاشاو قادر بەگ و دەیانی تریان دۆستایەتیی بە هێزو بتەو بووە. لەزۆر دانیشتن و كۆڕدا مەحمود پاشای جاف باسی شیعری مەولەویی كردووە، داوای كردووە لە دەنگ خۆشان بە ئاوازی پڕ جۆش و خرۆش شیعری مەولەوی بخوێننەوە.

مەولەوی وەك شیعر و لە هۆنراوەدا باڵابووە، هەروەها لە پەخشاندا نمونەی هەڵكەوتوویی بووە، وەك لە كوردیدا شاعیرو لوتكە بووە، لەعەرەبی و لەفارسیدا جێ پەنجەی دیارە.

# من و ئەم دیوانە

لە حوزەیرانی (١٩٧٥) دا دەستم دایە گۆڕین و وەرگێڕانی ئەم دیوانە، لە حوزەیرانی (١٩٨٦) دا هاتە کۆتایی، لە ماوەی (٦) مانگی نیوەی دوایی ساڵی دوا تر کاری بەغدام -وەك ڕەقابەی بینینی کتێبەکە لەلایەن خەبیری (کۆری زانیاری) یەوە- تەواو کردو (ئەمانەی گشتی لاوان و رۆشنبیری) هەولێر بڕیاری یارمەتی - مەبلەغی (١٨٠٠) دینارم وەرگرت و چوومەوە بۆ بەغدا.

لەڕێگای بەڕێز مامۆستا محەممەد عەلی قەرەداغی و بە ئاگاداریی بەڕێزیان و هەر لە ماڵی خۆیاندا لەتەك خاوەنی چاپخانەی (خلود) دا - کەبەتەلەفون هات بۆ ماڵیان پێکهاتین: بە ئۆفسێت و مەلزەمەی بە (٢٨٠) دینار بۆ(٣٠٠٠) نوسخەو لە ئەیلوولی ئەو ساڵەدا دەستی پێ بکا، وەکو پێشەکی مەبلەغی دوو هەزار دینارم دایە.

بە پێویستی ئەزانم ئەم تێبینیە بنووسم:

بەڕێزان مامۆستا عبدالکریم مدرس و محەممەدی عەلی قەرەداغی هەریەکەیان دوو کتێبی قەوارە گەورەیان لەو چاپخانەیەدا دانابوو بۆ چاپکردنیان.

دانانی ئەم دوو کتێبە لەو چاپخانەیەدا لەلایەن ئەم دوو بەڕێزانەوەو، هاتنی خاوەنی چاپخانەکە - بەتەلەفۆنێکی کاك حەمە عەلی بۆ ماڵی بەڕێزیان -باوەڕی بتەوکردم و، بۆ مسۆگەریی کارەکەم داوا ی نوسینێکم لێ نەکرد، تا پاشە ڕۆژ ببێ بە بەڵگەو هەڵی پێنچم.

پەنا بەخوا، هاوارمەلای خوا، لەئەنجامی ئەم کەمتەرخەمی و دڵ سافی یەمدا، ئەبێ چەند جار لەنێوان سلێمانی و بەغدادا بە کیرفانی پڕو هەڵتەکاوەوە چووم بینم و هاتبێمەوە؟ !! چەند جار ئەبێ بەتەکسی -لەناوەوەی بەغدادا- ڕێگام بڕیبێ وئاخ و ئۆفی نائومێدیم هەڵکێشابێ؟ وەلەماوەی پێنج ساڵدا بۆ چاپ کردنی ئەم دیوانە ئەبێ چەند گەڵای تاکی و پێنجێ و، دەم لە باخەڵی خۆم و باخەڵی بەزەیی لە دڵاندا بەخت کردبێ؟ داخی خۆم بەکێ بڕێژم و یەخەی خۆم لای کێ دادڕم و سکاڵای بەرمەلا.

نیشانەی سەرسوڕمان دانان و حەسرەت خواردن و هەناسە هەڵکێشان هیچ دادێ ناداو خەمێك کەم ناکاتەوە.

من لە ماوەی ئەم چوار ساڵ و نیوەدا بەرگەی ئەم هەموو کوێرەوەری و سزا جۆربە جۆرانەم گرت، دڵنیام و گومانم نی یە بەرگەی سزای سەختی دۆزەخیش ئەگرم.

بەڵێ هەرچەند بنووسم و هەرچەند سکاڵای کەساسیم بکەم و بکڕووزێمەوە بێ سوودەو جێ ناگرێ، (انا لله وانا اليه راجعون).

بەڵێ دوای تێپەڕبوونی چوار ساڵ و نیو (تنضيد) ەکەی تەواو کرد، بەڵام هەڵەی لەڕاست گەلێ بالآتربوو، لەبەر ئەمە کەس نەیتوانی (تنفيذ ) ی بکا، ئەوا ناچار بووم سەر لە نوێ بۆ چاپ کردنی و بۆ دووەم جار تێی هەڵچوومەوە، خواردنی پارەکەش لەلایەکی سێهەمەوە .. ئەمانەی گشتی .. هەولێر لێم چوو بە قیناو(١٠٧) دیناری غەرامەی خستە سەرم، بەبەڵگەی ئەوە چاپکردنی لە(٦) مانگ زیاتر تێپەڕیوە.

ئەمە حاڵی من و ئەم دیوانە سا بێ مەمرەوبمێنە مەولەوی واتەنی: (..دەك بەرقی غەزەب لە جەستەم بارێ)

## ئایا نەنگە بە کوردی بنوسرێ ؟

ئەمە دروشم و عنوانێکە دڵ ئەتەزێنێ و دەرون ئەهەژێنێ مرۆی تازە و کۆن شەرمەزار ئەکات ،زانایانی دێرینە ساڵمان لەبواری ڕۆشنبیریدا بەتەنیا خۆیان تەرخانکردوە بۆ خزمەتکردنی فارس و عەرەب ،زبانی زگماکی خۆیان خستوەتە پشتگوێ و بە هیچ شێوەیەك لایا ن لێنە کردوەتەوەو نرخیان بۆ دانەناوە ، نەك بە دەیان بەڵکو بە سەدان و هەزاران کورد بووە تەنیا دڵۆپێکی کوردی لەنوکی خامەکەیانەوە نەتکاوەتە سەر نامەیەك لەنامەکانیان، ئێمەی کورد پێش هاتنی ئانی ئیسلامی پیرۆز لە هەموو سەرگۆی زەوی ئێراندا لەو کاتە دا کە (ئەکباتن) هەمەدانی ئێستا پایتەختی میدیەکان بوو خاوەنی صەولەو جەولە بوین، فارسەکان قەڵەمڕەویان تەنیا شیرازبون و سەر بە میدیەکان بوون، هەموو سەرزەوی ئێران بە مادستان بەناوبانگ بوو.

مەولەوی !ئەی خاوەن بەهرەی هونەری وداهێنەرو فەڕبەخشی گوڵشەنی مەعانی و مەعنەوی ! ئەی دانیشتوی سەر لوتکەی هەرەبەرزی پەخشان وئەوزانی بەرینی دنیای جوانی و سیحراوی !ئەی ئاوێنەی باڵانمای سالارانی کۆڕو کۆمەڵی شەو بێداران و کەمەند لە پشتان !

مەولەوی !ئەی باوانەکەم !ئەی ڕابەرو جڵەو کیشێ کاروانی جیهانی جوانی داهێنەری دنیای دڵکەش و ئاوەدانی !ئەی جیلوە دەروصەفا بەخش و فەڕبە ئەنگێزەی

دڵانی ژەنگاوی !ئەی ڕشێنەری سەوزەی ئارەزوی جەرگەی وێژەخوازان و ئەدەب بازان !فەرهاد میرزای قاجاری واتەنی ((ئەی شاعیری باڵەخانەی چەم ))!هەزاران ئاخ و دادو حەسرەتان ،زبانم وشکە مێشکم بۆ شەو خامەکەم بێبڕشتە و هێزو پێزی نیە نەخشەو نیگارو پەیکەری بڵندی و بەرزی ئەدەبەی و ئەخلاقیەت..بنەخشێنێت ،پنە دارێکی وەك من لەتوانایدا نیە پانتایی گۆی زەوی هونەریت بپێویْ وجەولەی تیادا بکات. ئەو تەکان و تینەی نیە جۆروا جۆرو هەمەچەشنەی ڕەوشتە سروشتیە دڵکەشەکانەت لەلاپەڕەکانی مێژوودا بەگوێرەی پێویست برازێنێتەوە.

مەولەوی! ئەی هەوێنی بەزم و ئاهەنگی و شۆری دڵان !ئەی ڕازێنەرەوەی کەشی بەهارانی جوانی و خەزانی سەرماوەرزان! دەمێکە باوانەکەم !خۆری ڕوخسارت لەمن نادیارو پەنهانە، بەدرێژایی حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی بیستەم بەو پەڕی ئیشتیاق و ئارەزوومەندیمەوە بەرانبەر تیشکی چرای ڕوخسارت پەروانە ئاسا ئەسوڕامەوە، پەیتا پەیتا سەبووی پڕلەمەی و بارەت جامی گیانمت پاراو ئەکرد، لەو ماوەیەدا ئازیزەکەم !هەمیشە شنەی فێنکی نەسیمی گوڵشەنی فەرموودەکانت سنگ و بەرۆکی دڵە خەستەکەمی فێك ئەکردەوە، پەیتا پەیتاو بیْ پشوو تەزوی گیان بەخش و شادومانیت بەلەش و دەمارەکانما بڵاو ئەکردەوە و ئیلهامی گەشەی زینەد گیانت ئەدا بە دەماخ و گوێمدا..چونکە من لەو سەردەم و کاتەدا سەرقاڵ و سەرگەرمی گۆڕینی دانە دانەی گەوهەری ڕستەو وشەکانت بووم، بەو هیوایەی لەچپا سەرکەشەکانی هەورامانی خۆشەویستەوە بیانگوێزمەوە بۆ چیاو پێدەشتەکانی کوردستانی خواروو، لەکۆتایی هەشتاکاندا سەرەڕای پەیدابوونی دەیان تەنگەژەو کۆسپی دڵگووش و بەیاریدەی خوای بەخشندەو میهرەبان توانیم بەرگی یەکەمی ئەم دیوانە لەبەند ئازاد بکەم وبە چاپی بگەیەنم و بڵاوی بکەمەوە .

ئەو کاتە خواست و ئارەزووم وابوو ڕاستەوخۆ دوای دەرچوونی بەرگی یەکەم دەستم بدایەتە بەرگی دووەم، بەڵام ئەمەم بۆ نەڕەخسا، زەمانە هەردووباڵی بەستم و دوو پێی کۆت کردم، قات وقڕیو نەبوونی ..لەوکاتەدا دەرگایان پێگرتم وکپیان کردمەوە،زروفی نائارامی نەبوونی ئاشایش ژیانیان ئاڵۆوزکردم و خۆم هەموو شتێکم فەرامۆش کرد، بەڵام لەسەرەتای مانگی سێی دوو هەزاردا لەپڕ مانگی دووهەفتەی خڕو پڕی ڕوخسارە بێگەردەکەت بۆ دووەم جار لەژێر هەوری ڕەشی قەترانیەوە گۆشەی کێشا ،بەم

بۆنەیەوە لەهەموو گۆشەو کەناری ژینگەی هیوام دا ئەوەی پ بوترێت تاریکایی لەدڵ و دەرونمدا نەما، جا لەم کاتەداو لەبەر ئەو تیشکەی ڕوخسارتدا بەیاریدەو یارمەتی خوای باڵا دەست لەماوەی ئەم چەند مانگەی دوو هەزاردا بە ئاسانی لە جەوێکی پڕ لە فەڕدا بەرگی دووەمم ئامادە کرد.

مەولەوی! ئەی سەروەرو ڕابەرم !هەرچەندە تۆ ئێستا لەدنیایەکی نادیاردایت و دانیشتوی ناو شاری خامۆشانیت، بەڵام دڵنیام و بێگومانم بەبەزەیی فراوانی خوای گەورە بە پەنجەی توانای بێ وێنەی ئەو گۆڕەت ئێستا بووە بەو کۆشك تەلارانەی کە ئاسمانی شینیان گرتوەتە باوەش بەسەر ئێمەدا دەڕوانن و دەڕوانی، ئەمەش ئەزانم و لێم رونە لە ڕوانگەی پەنجەرە بێگەردەکانیەوە لەڕوی نازو نەزاکەتەوە نیگای گۆشەی چاوەکانت لە ئێمەیە ، تۆش هەرچەندە بەناو (مەعدوومی )،بەڵام دڵت زیندووەو زبانت پاراوەو ئەتوانی دۆعاو نزای سەرکەوتنمان بۆ بکەیت، کەواتە منیش لەلایەن خۆمەوە دەستی دڵ دەئالێنم بەداوێنی پاکی مەفهومی ئەم دوو بەیتەدا و ئەڵێم :

**تۆ سەبووی[1] مەی پێت، جام جای فیدای ڕێت**
**دڵ چاوی والێت بابێت ، سابا بێت :**
**خامە وەبێ من وەسەر تەحریرا**
**نامە وەبێ من وەسەر تەقریرا**

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای گەورەو باڵا دەست بە میهرەبانی خۆی یارمەتی دام توانیم بەرگی یەکەمی ئەم دیوانە بڵاوبکەمەوە ، ئەمەش بوە هۆی ئارامی‌وئاسایشی ڕۆحی گیانی ودەرونیم.

بەڵام ئازیزان !لەپێناوی ئەم بەرگەدا گەلێك تاڵاوی جۆربەجۆرم چێژاو گەلێك کۆسپ و تەگەرەی زەق و زل لەڕێگەمدا پەیدابوو، چاپخانەی (خلوود) لە بەغداد لەماوەی نزیکەی دوو ساڵدا لەسەرەتاوە تاکۆتایی کتێبەکەی تەنچیدکردو هێنایە کۆتایی ، بەڵام لەبەرئەوە هەڵەو پۆخڵەواتی لە ژمارە بەدەربوو، هیچ هونەرمەندێکی لێهاتووی ئەو بوارە خۆیان نەدا لەقەرەی و تەنزیمی بکەن، لەبەرئەوە گواستمەوە بۆ چاپخانەیەکی ترو سەرلەنوێ تەنچیدمکەیم تەواو کردو لە چاپخانەی( منیر) کرا بە فلیم

---

[1] سەبوو:کووپە،گۆزە،سەیری دیباچەی عەقیدە مەرخسیەکەی

و ڕایان کێشا، بەم ئاڵوگۆڕە –ئازیزەکەم زیانی ماڵیم لەچوارهەزار دینار تێپەڕی، جگە لەم مەبلەغەش دووهەزار دینارم بەناوی پێشەکیەوە دابوویە، ئەویشم بەفیڕۆڕۆیی، پاش ئەم بەسەرهاتە خاوەن چاپخانەکەی خلودم ڕوبەرووی خوای گەورە کردو ولێی گەڕام ،لەبەرگی یەکەمدا ئاماژەم بۆ ئەم گیرگرفت و ڕەنجەڕۆی و ماڵوێرانیەم کردووە.

# چاوگێڕانیک بەدیوانی مەولەویدا

ئەو زاناو نوسەرانە کە دڵیان بەندە بە ئەدەبی مەولەویەوە لەدەریای ناسنیدا مەلەوانن ڕاوبۆچونیان بەرامبەر بە ئەدەبی مەولەوی ئەمەیە: شای شاعیرانە، پێغەمبەری شیعرە ،کەڵە شاعیری چەرخی خۆی و پاش خۆی بووە..

منیش کە ماوەیەکی زۆرە سەرقاڵی ئەدەبی مەولەویم و و تیایدا تواومەتەوە هەمان ڕاو بۆچونی ئەوانم هەیە، لام وایە و بێگومانم ئەو هەست و سۆزو جۆش و خرۆشە کاریگەرانە لەسەرچاوەی قەریحەی بێگەردی مەولەویەوە هەڵقوڵاوە ، ئاشکرایە لە هیچ زەوق و تەبعێکی تردا بەو چەشنە پڕ لەتەکان و تینەوە سەری هەڵنەداوە ،هێنانی خەیاڵانی ناسك و سیحراوی و بەکارهێنانی دەف وکەف و مەی و نەی و سەنتور...بە تەنیا کاڵای باڵای مەولەویيە،باسی برۆ و کەمان و خەت و خاڵ و زوڵف و...شایستەی مەولەوەو بەس، کەوتنە ناو لاهوت و ناسوت و جەمال و جەلال.. بەتەنیا پیشەی جۆش و خرۆشی مەولەوەو بەس، چونە ناو کورەی عەشق و خۆشەویستی و فیداکردنی گیان و ڕۆح و لە پێناوی وەفاو جەفادا بە تەنیا زادەی قەڵەمی مەولەویەو بەس،باسکردنی نزیکی و دوری، یا وەصل و فەصل و سەوزەو شەونم و ئەشکەی چاوی شەو بێداران و ،خوڕەی لافاو و هاژەی تاڤگەو چەم و ڕووباران و بەرزو نزمی دیاران...بەتەنیا لەمەولەوی ئەوەشێتەوەو بەس.لاواندنەوەی ناوەختی ناکامی ئەامی جوانەمەرگان و تێکچوونی زوڵفانی شیرین نیگاو ڕەشپۆشی تازە نەوهاڵان ..بەتەنیا زادەی میشکی مەولەویەو بەس ،چوونی عێلی جافان بۆ کوێستان و هاتنەوەیان بۆ گەرمیان، باسکردنیان بەشێوەی سەرسوڕمان هەر لەمەولەوی دێو بەس کوڵم و ڕومەت کاتی ئارایشکردنیان و روشاندنیان بەبای خەیاڵ بەتەنیا کاڵای باڵای مەولەوەو بەس.

خوێنەری بەڕێز! لەم پیاهەڵدان وستایشانەدا مەبەستم ئەوە نیە بڵێم مەولەوی لەهەموو بوارو ڕوویەکەوە بەرەهای و بەموتڵەقی لە هەموو یەکە یەکەی شاعیرانی ترمان باڵاترو ، سەرکەوتوترە ،چونکە ئەم شاعیرانەش خاوەنی صەولەو جەولەن و، بەزەقی ئاسەوارو جێپەنجەیان لەسەر نەخشەی ئەدەب و ڕەوانبێژی...دیارو حەشا هەڵنەگرە.
لێرەدا ئەگەر بمانەوێت بەبێ لایەنی وەکو واقیع سەیری مەسەلەکە بکەین گەشتوگوزارێك بەناو چیاو دەشت و سارای ئەدیبان و ئەدەبیاتماندا بکەین، وشەیەك لەم کاتەدا سەرهەڵئەداو خۆی ئەسەپێنێ، پێویستە ئێمەش بەشێوەی ئیجابی دانی پیا بنن و بڵێن: ئێمەی کورد لە کوردستانی گەورەدا لە ساڵانی فرە دێرین زەمانەوە کەڵە شاعیران و لوتکەی نشینمان زۆرەو هەمووشیان جێی شانازین ،مەولەویش یەکێکە لەو لوتکە نشینانە، بەڵا م بەداخەوە ئێمە لەبەر ئەوە کە پەرش و بڵاوین و کیانی سیاسیمان نیە ،نەمانتوانی وەکو پێویست نرخیان بۆ دابنێن.

# هۆی کاریگەریی ئەدەبی مەولەوی

ئەو شێوە کاریگەری سیحراویەی که لە هەڵبەستەکانی مەولەویدا هەن بەو شێوەیەی کە لە هەڵبەستی شاعیرێکی تردا نیە؟

مەولەوی ئەمرو بەهرەوەرو هەڵکەوتوو لەکاتی گەنجیو سەردەمی فەقێتیدا بۆ ماوەی دوانزە یان سیازدە ساڵ لە کوردستانی ئەردەڵان هەورامان و باباندا گەشت و گوزاری بەخۆیەوە دیوە، بەدیان کۆڕو کۆمەڵانی ئەدیبان و شاعیران و زانایانی دیوەو سودو بەهرەی مەعنەویاتی لێوەرگرتوون و لیێیان وەرگرتوە، ئەمیش لەبەر ئەو زاناو داناو شاعیرو نوکتەزان و بلیمەت بووە پەروانە ئاسا لەدەوری تیشکی ڕوخساری کۆ بوونەتەوە، لێرەدا هەنگی ئەڕواحیان لە گوڵشەن وگوڵزاری مەولەویدا شیلەی گوڵیان هەڵمژیوەو پێوەی پابەندبوون، ئینجا لەکۆتایی قۆناغەکانی خوێندنیدا شیرازەی کۆڕو کۆبوونەویان بڕاوە، دوای ئەمانە لەناوچەکانی ئەوڕۆڵەیو شەمێران و تاوگۆزی بۆ هەمیشەیی و بۆ هەتا هەتایی جێگیرو نیشتەجێ بووە، ئەم بلیمەتە دڵ ناسکە وەفادارە لە پڕ لەو کۆڕو کۆمەڵ و جەماوەرە پڕ لە زەوق و ئاهەنگ و شادیو کامەرانیە دوور ئەکەوێتەوە، لەلایەن مەولەوی یەوە ئەو گشت ڕابواردنە جۆراو جۆرو هەمەرەنگە ئەبن بەخەون و خەیاڵ ؛ لێرەداو لەکاتی تەنیایی دا زبانی (حاڵ و قاڵی)بە هەنسك و ئاهو ئاخ هەڵکێشانەوە ئەڵێ:

خەم، خەفەت، مەینەت، لافاوانی خوێن

کامیان دێن بابێن ،یاخوا! بەخێربێن

لەژێر پەردەیەکی تردا بە ئاوازێکی سۆزی دەروونی ئەڵێ:

شی ئەو صەفاو سەیر دیدەن یاران

لوا ئەو دەورە، ئەو وەصەڵ جاران

سەیریکە چۆن مەنجەڵی دڵی دێتە جۆش و کوڵ و ئەڵێ :

دیدە وادەی سەیل هوونەی هووناوەن

دڵە!وەخت بەزم نۆشای زووخاوەن

وەشرەنگی!بازەم، سادەی بێرەنگی!

شادی!باوەسبۆ!وەختەن دڵتەنگی

مەولەوی و وەصڵ وفەصڵ حیکایەتێکەو نایەتە کۆتایی شیکایەتیکەو لێپرسینەوەی نیە ،

گۆش بدەر وەنەی حیکایەتشن
جەدەستی دووری شکایەتشن

مەولەوی لەجەنگەڵستانێکی چڕوپڕدایە بۆ ڕۆژانی ڕابرردوو ئەگری، مەڵبەندەکەی چۆڵ هۆڵەو لە هەموو نازو نیعمەتێکی حەزاری و پێشکەوتنێکەوە دوورو بێبەشە، نەمەدرەسەو خوێندنگا، نەسوختەو نە مستەعید،نە ئاهەنگ و نە بەزم و سۆزی دڵ،نە جادەی قیرو نەهێڵی ئاسن ،نەتەل و نەتەلگراف، نە گوەزرگای ڕێبواران و قافڵەو کاروان. ئەمانە لەژینگەکەی مەولەویدا – بگرە تائێستاش– سەریان هەڵنەداوە. ئێستا غاباتە چڕو پڕەکەیشی نەماوە بۆتە خۆڵەمیش و بابردی و بەدیاراندا، گوندەکەی مەولەوی کە مزگەوتەکەی مەولەوی کە شەونخونی تیا ئەکێشا ئاسەواری نەما. لەم کاتەدا لەم کاتەی تەنیایدا ژارو ژان و تاڵی و ترشی و سوێری ئەچێژێ خەم و خەفەت لەدڵی مەولەویدا خێمەی داکوتاوە.

بۆیە دەبینی هەڵبەست وهۆنراوەکانی پڕن لەخەم ومەینەتان لە هەناسە هەڵکێشان و گریەو فوغان و زاری.

بەیاسای گشتی ئەگەر کەسێك لەوڵاتی ئاوارەیی و غەریبایەتی گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی ئەوە بەو پەڕی بەختەوەرەوە لەناو کەس و کاری خۆیدا ژیان ئەباتە سەرو ئەحەسێتەوە .مەولەوی بە پێچەوانەوە لە غەریبایەتیدا رووگەش و لێوخەندە و دڵ ئاوەدان و ئاسودەو بێ ئەشك و خوێن بوو،لە زێدو ماواکەی خۆیدا ئەسیرو دیلی خەمان و شین و چەمەری بوو.

تەمام و رووی دنیا جە شادی کەیلەن
دڵ نەبۆ پەشێو فیراق لەیلەن
دڵ دوو زنجیرەی زوڵف نیگارەن
وە سەیر سەوزو سەحراش چ کارەن؟

ئەم شێوە ژیانە پڕ لە زام و زووخ و زووخاوە کەمەو لەویی تیادا ژیاوە، شاعیرێکی تری کوردەواریمان وەکو مێژوو شاهیدە ئەم شێوەی بەخۆوە نەدیوە، هەموو هەڵبەستەکانیان بۆیە دەرون لە هەنسك هەڵدان ئەشك خوێن شەو بێداری، شاعیری

پایەبەرزو بڵند نالی لەدوا قۆناغی تەمەنیدا غەریبایەتی وئاوارەییو بەخۆیەوە دی، لەو کاتەیدا قەصیدە بەناوبانگەکەی نوسی بۆ سالمی شاعیر، ئەو قەصیدەیەی بەشێوەیەك دایڕشتوە حوێندوەکەی ئاگر بەر ئەداتە ئینسان وە ئەیخاتە دنیایەکی ترەوە، نالی ئەمر مافی ڕەوای خۆیەتی ئەو نرخ و سەروەریە دانێ بۆ وڵاتەکەی خۆی ، چونکە ئەو سەردەمە سلێمانی مەڵبەندی عیلم و ئەقل و دانش و هونەر بووەو،جێی شانازی و سەربەرزی گەلی کوردەواری بووە، بەڵام وەك ووتم مەڵبەنەدەکەی مەولەوی دووربوە لەو شکۆو شکۆمەندەوە.

مەولەوی ئەمر لەم کاتەدا ئارەزوی شەو بێداری ئەدا لە کەللەی و دەست ئەئاڵێنی بە داوێنی سلوکی عیرفانی و (تصوف) دا، ئەبێ بە هاودەنگ و هاوڕازی کوڕی کەمەند لە پشتان و ریاچهت کێشان، ئەمەش زیاتر مەولەوی گۆشەگیر و کەنارنشینی دووپات ئەکاتەوە، چونکە (تصوف) خۆی لە خۆیدا جیهانێکی گۆشەگیرو ئینعیزالیە کەواتە لەم ئان و ساتەدا و لەم قۆناغەدا زانست و فەلسەفە و ئەدەب و لاهووت و عیرفان و (تصوف) لە مەولەویدا کۆئەبنەوە، بۆیە شیعرەکانی بە هەموو لایەنێکی وجوود و ژیاندا پڕشنگ ئەهاوێ و نەغمەو دەنگی بە هەموو گۆشەیەکدا بلأوئەکاتەوە.

مەولەوی لەم قۆناغەیدا پەنا ئەباتە بەر (مگرب) و (مغنی) بۆ ئەوەی بە ئاواز و نەوا و نەغمەی نەی و دەف و ساز و سەنتوور...لە خەوی بێهۆشی و غەفڵەت ڕاپەڕێ، لەم کاتەیدا دەمێ شەیدای جەمال و جەلالەو لە بازاڕی لاهوتیدا گەردش ئەکاو، دەمێ لە تۆیی کەمەندی بێداریدا لە گۆشەی تاریکی و تەنیادا بەرەو بارەگای ئەقەدەسی یەزدانی بە زەبوونیەوە ئەشك و خوێن ئەڕژێ، جار جارێ تر یادی خۆی هەڵئەواسێ بە جیهانی ناسووتیدا لە دووریی یاران و یاوەرانی ئەدوێ کە لە کاتی گەنجیدا تیایاندا توابۆوە . (٦)

## کێ لەمەیدانی ئەدەبی مەولەویدا خاوەن گەشتو گوزارە؟

ئەمانە زۆر زۆرو لەژمارە نایەن ،بە پێویستی ئەزانم پەنجەڕاکێشم بۆ هەندێکیان ، لەوانە:

١.ئەمین فەوزی بەگ (١٨٦٠-١٩٢٣ز)، ئەم کوردە دڵسۆزو وریاو نەبەزە لە سوپای عوسمانیدا ئەفسەرێکی پایە بەرزو لیێهاتووبووە،وە لەهەمان کاتدا شەیداو تینوی چێژی ئەدەبی کوردی بووە، ئەم زاتە بەهەستی پاك و خاوێنی نەتەوەیی کوردایەتیەوە لەساڵی (١٩٢٠)دا کتێبێکی بەناوی ((ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد ))ەوە دەرکردوە لەسەر ئەرکی خۆی بەچاپی گەیاندوە ، تیایدا باسی چەند شاعیرێکی کورد ئەکات، لەوانەش یەکێکیان مەولەوە،لە وێدا بەرزی بڵندی ئەدا بە مەولەوی و بەراشکاوی ئاماژە ئەکات بۆ سۆزو جۆش وخرۆشی شیعری مەولەوی‌و پایەو پلەی بەرزێتی‌و بڵندی ئەداتێ . ئەم پیاوە بەنرخ و هەڵکەوتوە شایانی تەقدیرو سوپاسە،چونکە لەو سەردەمەدا نوسین کەم بووە.

٢.حاجی تۆفیقی پیرەمێرد (١٨٦٧-١٩٥٠)، ئەم وەتەن پەروەرە ئەم ئەدەب دۆستە لە دیباچەی بەرگی یەکەم و دووەمی ( ئەصل ورۆح)ە کەیدا ئەفەرموێ: ((بەوتەی خۆم نەبێ ئەدەبیاتی زۆر قەوم و ناودارانی زۆر میللەتم دیوە، هیچیان ئەوەندەی مەولەوی پڕ جۆش و خرۆش نیە، خۆزگە ئەهلی دڵ ئەیخوێندەوە))، وە ئەفەرموێ: ئەمە مەولەوی خۆی و ئەمیشە شیعرەکانی ،وەك ئاوی حەیات لەتو میدادا)).وە ئاماژەش بۆ ئەوە ئەکات کە گۆرانی شاعیرمان زۆر شەیداو پابەندبووە بە مەولەوی یەوە ، بەلایەوە شیعرەکانی مەولەوی سەرتەڵ ولوتکە نشینن.

با ئەوەشمان لەبیرنەچێت کە پیرەمێرد بەچاوی خۆی مەولەوی دیوە وقسەکانی بەدانە دانەی گەوهەر دائەنێ.

لە دیباچەی بەرگی یەکەمی ئەصل وڕۆحەکەیدا ئەڵی:((ئاخ خۆم ئەیزانم چەند رەنجم داوە تا لەم لەو لا کۆم کردودتەوە خوا حەقە بۆ ئەمە موفتی ..دیوانی مەولەوی دابێ و حەسەن بەگی عەلی بەگی جافیش سەراوردی مەولەوی دەست خستم،خوا هەردووکیان پایەدارو کامگار بکات)). وە ئەفەرموێ((سەید محەممەدو سەید مەحمودو سەید ئەحمەد و سەید عبداللەچوار کوڕی بووە لە چوڕستانە ڕەچەڵەکی براوەتەوە، تەنها

سەید عبد الله ماوە ناچار رایی کردوە وگوازتوویەتەوە پشت قەڵای شەمێران لە دێی سەرشاتە لەویٚ وەفاتی کردوە ، تأریخی وەفاتی مەولەوی ١٣٠٠ھ،١٨٨٢ن)).
وە لە دێباچەی بەرگی دووەمیدا پیرەمێرد ئەفەرمێت((خوا ئەیزانیٚ و ئەهلی مەعنا باوەڕئەکەن کە ڕۆحی مەولەوی وەك مەپنهوی مەولەوی ١ڕۆح نەوازو دڵ پەسەندە..)).٢
٣.ئەنوەر قادر محەمەد:ئەم بەڕێزو پایە بەرزە ئێستا دانیشتوی هەندەرانە ،ئەم لاوە شکۆمەندە لە یەکێك لەزانکۆ کانی مۆسکۆ بروانامەی وەرگرتوە،ئەتروحەکەی لە ئەدەب و ژیانی مەلەوی ئەدویٚ ، لە (١٩٩٠) لە ستۆکهۆڵم بەچاپی گەیاندووە، بە شێوەیەکی شیاو و گونجاو لە (٢٩٠) لاپەڕەدا بە قەوارەی ناوەندی بڵاوی کردەوتەوە ،ئەم دڵسۆزە ژیرانەو زانایانە لەمەولەوی ئەکۆڵێتەوە ،بە شێوەی شیاوی ئەم چەرخە لە ئەدەبی مەولەوی ئەدویٚ ولە لوتکەی بەرزیدا دایئەنیٚ و ئەینرخێنیٚ.

ئافەرین ئەی جگەر گۆشەی مەلا قادری خواپەرست و ڕوگەش و میهرەبان و سەخی و زبان پاراوو دەرون خاوێن!وە لەهەمان کادا عاشق و شەیدای سازو سەنتور وسۆزی نەی ومەی ودەفی مەولەوی .ئافەرین ئەی ڕاگێڵی ئەدەب و زانیاری!ئەی ئاوارەی هەندەران و ،دوور لە زێدو ولاٚت و وەتەن ،توانیت سەرکەوتوانە ئەسپی تەبعو ئارەزووت لەمەیدانی بەرفراوانی مەولەویدا تاو بدەیت و گۆی پێشڕەوی بەدەست بهێنیت . بەڵام بەداخەوە ئازیزەکەم !نوسینەکەت پڕ لەوشەی بێگانەو بەگۆش و هۆشی مێشکی ئێمەوە ئاشناو هۆگر نین، لە جیاتی ئەوەی بنوسیت هەڵکەوت حەکیم بەلاسایکردنەوەی ئەورووپاوە نوسیوتە حەکیم هەڵکەوت کتێبەکەت پڕە لەوشەی بێگانە

گیانەکەم بۆ ناگەڕێتەوە وڵاتی خۆت لەناو کەسوکارو هۆزو کۆمەڵانی دوورو نزیکتدا ژیان بەسەربەریت، بۆ پیاوێکی وەك بەڕێزتان ژیانی ئێرەت مسۆگەرترە، زانکۆکانی سلێمانی یان هەولێر شانازیت پێوە دەکەن، مانەوەت لەویٚ جێی نەهامەتیو جێی سەرگەردانە.

٤- عەلادین سەجادی: ئەم زاتە پایە بڵندە لە(مێژووی ئەدەبی کوردی) ییەکەیدا لە(١٩٥٢) دا لەچاپیداوە، لەلاپەڕە(٢٤٧)ھ وە تالاپەڕە(٢٧٦) لەمەولەوی ئەدویٚ و ئەنووسیٚ: (بادەنۆشی خانەدانی تاوەگۆزی..پێغەمبەری شیعری سەدەی ڕابوردوو،

(١) مە ئنەوی کتێبکە هۆنراوەی مەولانای ڕۆمیە، لە شاری قونیەی تورکیا نێژراوە .

شۆڕشگێڕی باوەڕی تازەو نۆ..پێشەنگی کاروانی دوڕناسان..مەلەوانی دەریای بیرتیژی، شۆڕەسواری سارای نوکتە بێژی، ل(٢٤٧).

کەوابوو مەولەوی هەم خۆشخوانی حەقپەرستی بووە، هەم نەواخوانی بەزمی سەرمەستی!!، شاعیری بەرزی ئاسمانی کوردەواری..)،ل(١٤٨).

لەساڵی(١٨٠٦)ز لەدایك بووە، بەفەقێتیی چووە بۆ (نۆدشە) و مەریوان و چۆڕە و نەنەو، سنەو بانەو سلێمانیو هەڵەبجەو جوانڕۆو پاوە..(ل٢٥٠).

مامۆستا سەجادی لای وایە لەقەبی مەولەوی یا نازناوی مەولەوی لەلایەن خزمەکانی عەنبەر خاتوونی خێزانەوە براوە بەسەریا، لەدوادا لەلایەن غوڵام شاخانی والی سنە لەکۆڕشێکی گەورەو فراواندا-بەڕەسمی- ووشەی مەولەوی ئەکا بەلەقەبی شەعبی بۆ مەولەوی (ل٢٥٢).

وەهەروەها مامۆستا سەجادی لەمەولەوی ئەدوێو ئەڵێ : (ل٢٥٥)( مەولەوی خۆی پێغەمبەری شیعرو زەڕنگەری خەیاڵی شیعرو پەیکەرتاشی ئاسمانی شیعر بووە).

(بەبێ شك مەولەوی بەرزتر شاعیری سەدەی نۆزدەهەمی کوردە، تا ئەم تاریخەو بگرە هی پێشەوەش، نەوەك هەرئەوەندە بەڵکو ئەگەر بەراوردی خەیاڵی شیعری مەولەوی لەگەڵ شاعیرەکانی سەدەی نۆزدەهەمی غەیری کورددا بکرێ هەموو زمان و قەڵەمێك دانبەوەدا ئەنێ کەفکری بەرزی مەولەوی لەسەر رووی هەموویانەوەیە،

وە لەلاپەرەی(٢٧٤) دا ئەفەرموێ : ( .. کەوابوو ئێستا مەولەوی چۆن هاتە پێش چاو و لەچەند پەردەدا دەرکەوت ؟؟..مەولەوی بەبەرزتر ئەدیبێکی کورد هاتە پێش چاو و لەپەردەی فەلسەفە، تصوف، غەرام، مەفتوونی تەبیعەت، شاعیرێکی زۆر ووردی بیرتاش، نوکتەزان و فیکر بەرزدا خۆی نواند، بەجۆرێك خۆی نواند کەهەرشوێنی بەرزی لەمەیدانی ئەدەبیاتی کوردیدا بۆخۆی تەرخانکردو بووبە مامۆستای مامۆستاکان).

خوێنەری ئازیز! وەکو بینیت- مامۆستا سەجادی - لەگەشتەکەیدا مافی لوتکەنشینی ئەدابە مەولەوی و بەپێغەمبەری شیعری دائەنێو لەخەیاڵ ناسکیدا کەسێکی تر نەیگەشتووەتێ.بائەوەشمان لەبیر نەچێت مامۆستا سەجادی لەچەند شوێنێکدا لەگەشتەکەیدا واتە لەو کاتەدا کەئەچێتە کەمینەوە بۆ ژیان و مەعنای

هەڵبەستەکانی مەولەوی دەستی تەتەڵە ئەکاو نیشانە ناشکێنێ و هەدەف ناپێکێ، واتە لەچەند بۆچونێکیدا ڕەخنە بەشەرمەوە لەڕووی دێ یەخەی بگرێ.

رەخنەی یەکەم:

لەلاپەڕە(٢٧٢)دا بڕوانە چۆن چووە بۆ مەعناو مەبەستی ئەم تاکە بەیتە کەبەشێکە لەقەصیدەیەکی (٢٨)بەیتی:

بی کۆڵ وەی وەکۆڵ پەی دەردان دەرد

ماساو جەسەراو ڕێزاو هەرزان کەرد

(ع،م)لەدیوانەکەیدا لاپەڕە(١٦٠-١٦٦)بەم شێوەیەی خوارەوە مەعنای تاکە بەیتەکە ئەکا: (وی کول:بێیە کۆڵە. زەردان دەرد: ئەوانەی تووشی زەردوویی هاتوون.ماساو: ماسی. ڕیزان: کەوتن. واتە داربێیە کۆڵەکان لەبەر سەرمای پایز دەردوو بەلا چووەتە کۆڵیان، وەئەوەندە ووردەگەڵای تاڵیان داوە ڕاندووە بۆ ناو ڕووبارەکان، ماسی یەکان هەموو مردوون و کەوتونەتە سەرئاو، وەماسی زۆر بووە بۆ ئەوانەی گرفتاری دەردی زەردوون و پێویستیان بەماسیێیە تەماشای بکەن تا چاك ببنەوە. لەکوردەوایدا مەشهوورە زەردوویی دار سەیری ماسی بکا چاك ئەبێتەوەو دەردەکەی تووشی ماسیێیەکە ئەبێت.)ل١٦١.

ماموستا سەجادیش بەم شێوەیە مەعنای بەیتەکە ئەکا.ل٢٧٢: (جارێك تازە بووکێك زەردوی گرتبوو..ئەمیش هەڵستێ ڕوونەکاتە ئەوچۆڵەو، تووشی کانیاوێك ئەبێ لەبناری-دێی-هانەسوورە کەماسی تێدائەبێ و دار(بی)ێك لقی بەسەر کانەکەدا شۆڕکردبوەوە، ئەچێتە سەر لقی دار (بی)یەکە سەیری ماسیەکان بکا لەناو ئاوەکەدا. مەولەویش لەو وەختەدا بەسەرائەچێ تەماشا ئەکا ماسیەکی زۆر کەوتۆتە سەرئاوەکە تومەز ئەمە(بوك)ە هەر تەماشای ماسیەکانی کردوە مردوون و کەوتونەتە سەرئاوەکە! ئەمیش ئەڵێ: (بی)یە کۆڵەی وەوی لەکۆمەڵ کەبۆ ئەوەهاتووە دەردی لەکۆڵکەوێ بەهۆی دەردەکەیەوی(وەها) ئەوەندەی ماسی ڕژاندەسەرئاوەکە هەرزانی کرد.) داڕشتنەکەی ماموستا سەجادی کت و مت وەکو خۆی نوسراوەیەوە. لێرەدا سەجادی خوالێی خۆشبێت لەراستی لای داوە، ووشەی (وەی وەکول) بە وەوی لە کۆڵ کەوتۆتە بەرچاوی، (ڕێزان)ی بەڕێزان وتەعبیرکردوە، (زەردان) بەدەردان، ئەمەش دیارە پێچەوانەی هەموو نووسخەکانە. ئەم تاکە بەیتە بەشێکە لە قەصیدەیەکی(٢٨)

بەیتی،وەکو(ع،م) ئەفەرموێ(ل:١٦٠) مەولەوی بۆ دۆستێکی جافی نووسیوە کەلە کوێستان ماوەتەوەو لەگەڵ عێلانە گەڕاوەتەوە. ئەم بەیتە پەیوەندی بەدێی (هانەسورە)و بوکی تازەوە تە، ئاوەکەی هانەسوورە کانیاوێکە بەحاڵ وەیابە ئاستەم بەشی پێویستی دەکەنەکات، هیچ کەس لە ژیانیدا ماسی لەو کانەدا نەدیوە.

رەخنەی دووەم:

سەجادی لای وایە(ل:٢٤٧)خۆشەویستی شێخ عوسمانی تەوێڵە پاڵی پێوەناوە کەبەهەورامی شیعری ووتوەو،ئەفەرموێ: (ئیتر زمانی شیعری لەخۆشەویستی شێخ وەسمانی تەوێڵەوە ئەبێ بەزمانی هەورامی). وەك لە پێشەکی بەرگی یەکەمی ئەم دیونەیدا ووتوومە مەولەوی پێش ئەوەی شێخ عوسمانی تەوێڵە بناسێت واتە لەزەمانی فەقەتی و سەرجەمی گەنجدا بەهەورامی شیعرەکانی نووسیووە، لەهەموو تەمەنیدا هەر بەهەورامی شیعری ووتووەو بەزارەوەیەکی تری کوردی شیعرو هەڵبەستی دانەناوە.

رەخنەی سێیەم :

سەجادی ئەفەرموێ: (ل:٢٧٥-٢٧٦): لەماوەی (٣)ڕۆژدا ئەو قاعیدە عەرەبە دائەنێ بەشیعر..)

ئەم قاعیدە عەرەبەی مەولەوی ناوی (فضیلة)یەو لەعیلمی کەلام ئەدوێ‌و پێکهاتووە لە(٢٠٣١)بەیت، عبدالکریم المدرس شەرحێکی دوورو درێژی لێکردووەو بەناوی (الوسیلة فی شرح الفضیلة) بەچاپی گەیاندووە. ئایا ئەچێتە مێشکەوە کتێبێکی قەبەو زل لەماوەی (٣) ڕۆژدا دابنرێت؟.

رەخنەی چوارەم:

سەجادی لەلاپەڕە(٢٥٢) ئەفەرموێ: (خاتو عەنبەر چوار کوڕی بووە، شێخ محمەد، شێخ ئەحمەد، شێخ مەحموود، سید عبدالله. لە ژنێکی تریشی(سێ) کوڕی تری بووە، سید هادی، سید حسن، سید حسین. جەنابی پیرەمێردیش لەکوڕەکانی مەولەویدا لەڕاستی لایان داوە، مەولەوی شێخ ئەحمەد شێخ مەحموود ناوی نەبووە، ئاشکرایە وەکو سەجادی ئەفەرموێ وانە، مەولەوی جگەلە عەنبەر خاتوون ژنی تری نەهێناوە وە بەهیچ شێوەیەك نەبووە و نەبیسراوە مەولەوی لەو ژنە وەهمی و خەیاڵە هادی و حەسەن و حەسنی بووبێ. لەکۆتایی ئەم دیوانەدا شەجەرەی نەژادی مەولەوی و نەوەکانی ئەنووسمەوە انشاءالله.

٥- دکتۆر سۆران سنەیی: ئەم ئالآ بەرزە، ئەم پایە بڵندە بلیمەتە بەکامێرای عیلم و زانستەوە، بەقەڵەمە بەبرشتەکەیەوە زیرەکانە بەناو جیهانی ئەدەبی مەولەویدا گەشتێکی کردووەوەمەردانەو سەرکەوتوانە هاتۆتە دەرەوە، لەگەشتە پڕبە هوەکەیدا پەردەی لەسەرنهێنیەکانی مەولەوی لاداوەو زانایانە خستوونیەتە ڕوونرخاندوونی. گەشتەکەی ناوناوە(رسالەی عشق لەمەولەوی ناسیدا) لە چاپخانەی (ئینتیشاراتی سەلاحەدینی ئەوبی)بە ٥٨٦لاپەڕەلە١٩٩١ی میلادیدا بەجوانترین چاپ بەچاپی گەیاندووە، پێشەکیەکی (٧)لاپەڕەیی ی بۆنووسیەوەو بەجوانترین دیمەن و سەرنج ڕاکێش و سیحراوی چەند گۆشەو کەنارو قوژبنی نەخشەی گوڵشەنی ئەدەبی مەولەوی پیشان ئەدابۆن و بەرامی مێشکی پینسانی هووشیارو ئەدەب پەروەرکاس ئەکاو ئەیخاتە جیهانێکی پڕ لەسەرگەردانەوە، وەك (..مەولەوی، یەکەم هەستیارو زاناو عارف وفەیلەسوفێك کە چێژی ژنیەژانی ئەم ڕۆژگارە چەپگەردەی کردبێ، دڵنیام دوان کەسیش لەم تاقمە نە، بەڵام بۆم ڕۆشنە کەیەکێکە لەو پۆلە ڕەنجەڕۆیانە والەڕۆژگاری خۆیدا، ئەگەر لەناو کۆمەڵگاکی هونەر پەروەرو فەرهەنگ پێشکەوتوودا ژیابا، هەزار ئەوەندەی ئێستا ئەشکۆفیاوەو سەد ئەوەندەش بەرهەمی فەرهەنگی لەخۆیەوە بەجێ ئەهێشت. مەولەوی لەناو ئاپورەەکی سادەو پاك دڵ و ڕەنجیکێش، بەڵام ستەمکێش وژێرچەپۆکدا ژیاوە. لەسەردەمی ئەودا، ڕەنگە هەرئێستاش، هونەرو هونەرمەندو بەگشتی فەرهەنگ وفەرهەنگپەروەر مەگەر بەدەگمەن بایەخێکی بۆ دانرابێ...)ئەم زاتە-ئەم زاتە وەکو خۆی ئاماژەی بۆ ئەکاودەری ئەبڕێ (نیوەی تەمەنی لەپێناوی ناسینی مەولەویدا بەخت کردووە.وە ئەڵێ: (فاسیلەی نووسینی ئەم کتێبە هەتاکو لەچاپدانی، لەبەر چەند هۆی دیارو نادیار سێ چوارساڵێکی کێشاوە. هەرچۆنێك بێ، لەئاسانەی سیوپێنجەمین ساڵی ژیانی خۆمان، ڕەنجەڕۆیانە ئەم بەرهەمە پێشکەش بێ بەنەتەوە بەڕێزەکەم..). ئەم هێژایە لەدیوانەکەی مەولەویدا(٤٥) قەصیدەی هەڵبژاردووە، زیرەکانەو بەوپەڕی جوانکاری و شکۆمەندەوە ڕاڤەو شیتاڵیان ئەکا، کۆی قەصیدەکە ئەنوسێت و ژمارە بۆتاك تاکی بەیتەکانی دائەنێ‌و لەدوادا دێتەسەر ڕوونکردنەوەی:واژەکان،تەرکیبات، زارەکان، واتای شیعرەکان، ڕوانگەکان...جا بەشێوەی شیاو ئەچێتە ناو جەرگەی قەصیدەکەوەو بەپەڕی کارامەوە نەشتەرگەریی ئەکاو هەڵیئەسەنگێنێ. لەکۆتایی ئەم چەند دێڕەمدا زۆر زۆر سوپاس وستایشی کاك

دکتۆر سۆرانی بەڕێزئەکەم بەرانبەر بەم تێکۆشانە پرشکۆمەندەی، ڕووی ئومێدی تێئەکەم کەقەڵەمەکەی هەمیشە لەگەڕان بێ بۆ زیاتر ڕۆچون لەدەریای مەولەوی ناسیندا، هێشتا زۆری ماوە کەبتوانین گەمارۆبدەین بەجیهانی فراوانی مەلەوی‌داو شوێن وجێگای ڕاستەقینەی دیاری بکرێت.

لەخوای باڵا ئەپاڕێمەوە ئەم نوسراوانەو نمونەیان بپارێزێ.

٦- عبدالکریم المدرس: ئەم زاتەپایە بڵندوناوازەیە، ئەم دڵسۆزو بلیمەت وهەڵکەوتوە، بەسواری ڕخشی وویست وئارەزوی خۆیەوە شێرانەو مەردانە گەشتێکی چەند ساڵەو درێژخاەنی بەجیهانی فراوانی ئەدەبی مەولەویدا کرد، گەشتەکەی گەلێ سەرکەوتووبوو. توانی بەتیشکی کامێرای دەرك و ئیدراکی تیژی تابلۆمانی ئاسا(١) بیانخاتە بەر چاوی ئەدەب ناسان وفەرهەنگپەروەران و شەیدایانی خەق وخەقیقەت . بەڕاستی هەر ئەو بوو-پێش هەموو کەس- جیلوەی دا بەئەدەبی مەولەوی و،پەردەی لەسەر نهینەکانی مەولەویی لاداو کۆمەڵانی خستەسەر شەقامی ناسینی مەولەوی.

ئەم زاتە بەتوانایە لەساڵی(١٩٦١-ز) لەبەغدا لەچاپخانەی (النجاح) دیوانی مەولەوی بەچاپ گەیاند. محەمەدعلی قەرەداغی واتەنی (دیوانی مەولەوی مامۆستا مەلاعەبدوالکەریم بەیەکەم کاری ڕێك وپێکی لێکوڵینەوەی ئەدەبی کورد دەژمێرێت و تائەوکاتەی ئەودیوانە دەرچووە نمونەی لەکتێبخانەی کوردیدا نەبووە).ئەم دیوانەی بەڕێزیان پێکهاتووە لە(٥٤٤)لاپەڕە، شیعر بەشیعر یا بەیت بەبەیت مەعنای ووشەو واژەکان ئەکاو بەجوانترین شێوەو شێواز مەبەست و نهێنیەکانی ئەخاتە ڕوو و شەن و کەویان ئەکا.بەداخەوە ئەم بەڕێزە لەکاتی گەنجی و لاویداو لەوسەردەمەیدا کەلەبیارە بەتەدریسەوە سەرقاڵ بووە، لەوێداو لەوکاتەیدا ئەگەر ئەم پرۆژە پیرۆزو بەنرخەی ئەنجام بدایە هەڵبەت گەلێ باڵاو بایەخدارتر ئەبوو،چونکە بیارە لەو ڕۆژگارانەدا ئارامگایەکی مەعنەوی و سەرچاوەیەکی ڕۆحی بوو،مەلاوزاناو ئەدەبیان کۆمەڵ کۆمەڵ ڕوویان تێ ئەکردو ماوەیەکیایدا ئەمانەوە، جابەبۆنەیەوە مامۆستا-ئەگەر بیویستایە - بەئاسانی ئەیتوانی بەدەیان نوسخەو بە یاضی شیعرو پەخشانی مەولەوی لەڕێگای مەنسوبان و موریدانەوە کۆبکاتەوەو سوودیان لێ وەرگرێت ، وەبەئاسانی بۆی ئەکرا شیعری مەولەوی و غەیری مەلەوی -بەهۆی فرە نوسخەوە-لێك جودا بکاتەوە.بەتایبەتی لەوکاتەدا بەدەیان کەس لەو زیارەتکەرانە مەلەوان دیوەو لەژیانی

شارەزابوون و، زۆربەشیان عاشق و شەیداو پابەندی هەڵبەست و هۆنراوەی مەولەوی بوون، مامۆستا(ع.م) لەدیباجەو پێشەکی دیوانەکەیدا ئاماژە ئەکا بۆ ئەمە. بەڵام بەداخەوە-وەکو خۆی دانی پیائەنێ لەو کاتەیدا ئەو بیرو هۆشە لەکەللەیدا نەبووە لە مەولەوی بدوێ. بەڵام هەرچی چۆن بێ، ئێستاش دیوانەکەی زۆر بەکەڵکەو جێی شانازە. لەناخی دڵ و دەروونمەوە ئەڵێم: ئەگەر ئەم بلیمەتە نەبوایەو ئەم دیوانەی بەچاپ نەگەندایە هەرگیزاو هەرگیز.کەسایەتی مەولەوی نەئەناسراوشیعری مەولەوی نەئەزانرا. خوای پەروەردگار بەرانبەر بەم کردارەی پاداشتی چاکەی بداتەوە.

٧-محەممەد عەلی قەرەداغی: ئەم زاتە دڵسۆزە شەیدای ئەدەبی کوردو کوردەوارە بەتایبەت لەمەولەوی دا تواوەتەوە. بەناوی (شارۆیەك لەباخچەی ئەدەبی مەولەوی) دا نووسینێکی(٤٤) لاپەڕەیی لەسەر مەولەویی نووسیووە، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، لەساڵی١٩٧٨دا لەبەرگی شەشەمدا بۆی بڵاو کردۆتەوە. لەپێشەکەیدا نرخ و پایە بڵندی و بەرزی بۆ مامۆستا عبدالکریم المدرس دائەنێ کەتوانیویەتی بەسەر کەوتووانەو زانایانە لەدیوانی مەولەوی بدوێ و بنووسێت. سۆزی مامۆستا عبدالکریم بەرانبەر بەکەسایەتی مەولەوی و شەیدابوونی بەووتەی مەولەوەوە دەرئەبڕێو ئەڵێ (..گەلێ جار وابووە لەخزمەتیدا دانیشتوم شیعرەکانی مەولەویی بەسۆزێکی خۆشەوە خوێندوەتەوەو، بێ پەروا هۆنە هۆن فرمێسك لەچاوەکانەوە جۆگەلەی بەستوەو ڕیشە سپە جوانەکەی تەڕکردوە..ئەو دانیشتنانەو ئەو سۆزە بەیتانە شەیدای مەولەوی و شیعری مەولەوان کردم و ، بە زۆرەملێ خۆم بەسەرردادەبڕین..)وەهەروەها لەسەری ئەڕواو ئەفەرموێ: (هەر بەوە کە شەیدای جیهانی ئەدەبی مەولەوی بووم هەرباسێك یان شیعرێکی چاپ نەکراوی مەولەویم بیستبێ لەسوچێکدا نووسیومە. وەتازیاتر لەو دیوانە ووردبومەتەوە زیاتر بۆم ڕوونبوەتەوە جیهانی مەولەوی جیهانێکی تایبەتەو، هێشتا ڕێزی خۆی لێنەگیراوە، گەلێ لەوە زیاتر هەڵدەگرێت، کەتا ئێستە بۆی کراوە). وەئەفەرموێ: (لەئەنجامی ئەو سەرنجدانانەشمەوە بۆم دەرکەوتووە کارەکەی مامۆستا لەگەڵ ئەو هەموو نرخەیداو لەگەڵ ئەوەشدا کەبەهەموو بڕوایەکمەوە دەڵێم : ئەو کارە بە مامۆستا نەبوایە بەکەس نەدەکرا. هێشتا کاروانی شیعرو ئەدەبی مەولەویی نەگەیاندوەتە دوا قۆناغ وزۆربەی بەبەرەوە ماوە..) ئەم بەڕێزە لەم (شارۆ)کەیدا گەلێ ڕەنجی کێشاوەو، لەئەندازە بەدەر ماندووبوونی بەخۆیەوە دیەوە، بۆم هەیە بڵێم

نووسینەکەی گەلێ بەنرخە، بۆئەوە ئەشێت کەسەرچاوەیەکی گرنگ بێت لەپاشە ڕۆژدا بۆ ڕست و ساغ کردنەوەی شیعری مەولەوی . لەبەرگی سێهەمی ئەم دیوانەمدا-خوای گەورەوبالاّیارمەتیم بدا-سوودلەم نووسینە وەرئەگرم و پشتی پێئەبەستم.

مامۆستا محەممەد عەلی قەرەداغی شایانی تەقدیرو ڕێزە، بۆ پێشکەوتنی ئەدەبی کوردی بەگەرمی وبەدڵسۆزی هەمیشە تێئەکۆشێ وبێ ووچان قەڵەمەکەی لە گەڕدایە، پیاوێکی یا مەردێکی دنی و دنیاە، وەهەمیشە دەرگای یانە خنجیلانەکەی لەسر پشتە بۆدۆستان و بێگانەو خزمانی، حاتەم ئاسابەدەمیانەوەپێئەکەنێ وڕێزیشیان بەواجب ئەزانێ.

٨- شێخ عبدالعزیزی پارەزانی (١٩٢٥-١٩٧٦): ئەگەر ڕەوشت وخووی بەرزو ڕەفتاری پاك و کرداری چاك و ئان پەروەری و جوامێریی دنیایی ..بکەیت بەپێوەری هەڵسەنگاندنی مرۆڤ، ئەوە بەبێ گومان مامۆستا شێخ عبدالعزیز پارەزانی مافی ئەوەی هەیە لەلوتکەی بەرزی مەجدوشکۆو شەرەفدا جێگای دیاری بکرێ وبەشانازییەوە پەنجەی بۆدرێژبکرێ.

لەسەرەتای پەنجاکانیسەدەی ڕابردووەوە لەڕێگایخوێندن وفەقێتەوە بەناسینی ئەم ئالاّبەرزە پابەندو شەرەفیاب بووم، بۆماوەی(٢٦)ساڵ وەکویەك ڕۆح لەدوو بەدەندا ژیانمان بردەسەر. لەئەندازە بەدەرسەخی و ڕووخۆش و دڵفراوان بوو، ڕق و قین و خۆشەویستی و محەببەتی لەبەر خوابوو، وەکوهەموو زاناو ئەدەب پەروەرانی کوردستانی لەژێربالّی ڕەشی هەژاری و نەبوونیدائەژیا. ئەم بەڕێزە -وەکو خواترسێکی هەمیشەیی-بەگەرمی و سەرومڕخەریکی خواپەرستیبوو، هەموفەرزو پێوویستیەکانی ئانی پیرۆزی ئیسلامی بەبەردەوامی جێبەجێی ئەکردو لەکاتی خوێندا ڕای ئەپەڕان.

لەخۆشەوویستی ئیمامی شەهید(حسن البنا)و سەدقوتب توابۆوە، بەبیرو باوەڕی ئەوانەوە خۆی گرێ دابوو. ئەم زاتە خواناسە لەشەستەکاندا زنجیرە کتێبێکی بەچاپ گەیاند، لەوانە یەکێکیان (ژیانی پێغەمبەری مەزن)بوو،من خۆم سەرپەرشتی چاپەکەیم ئەکرد، تائیستا چەند جار چاپکراوە. داخەکەم مەرگ فرسەتی نەدا درێژەبەنووسینەکانی بدا. ئەم زاتە بۆ گۆڕینی مەولەوی لەهەورامەوە بۆسۆرانی

یارمەتیی ئەدام وهەمیشە بەگەرم هانی ئەدام بۆ تەواوکردنی ئەم پرۆژەیەم (فسلام الله علیه یوم ولد ویوم یموت ویوم یبعث حیاً).

٩-شێخ بابە عەلی: ئەم زاتە هەڵکەوتووە کوڕی عەللامەی بەناوبانگ شێخ عومەری قەرەداغە(١٣٠٣-١٣٥٥ك). ئەم بەڕێزە نازی باوکێتی بەخۆیەوە نەبینی لەسکی دایکیابوو باوکی بەڕێزی کۆچی دوایی کردو،لای باوکی دایکی ژیانی‌منداڵی بردەسەر. لەسەرەتای پەنجاکاندا بەناسینی ئەم زاتە شەرەفیاب بووم و، دووپێی دڵم بووبە تەڵەوخۆشەویستەوە. ئەم هێژایە ماوەیەکی زۆر بەگەرم و خولیای بەرهەمی مەولەوی بوو، شەیداو عاشقی شیعری مەولەوی بوو، لەمیانەی ئەم خولیایەیدا دەربارەی مەولەوی دوونووسینی بەچاپ گەیاندوبڵاوی کردنەوە. یەکەمیان بەناوی (هەڵبژاردەیەك لە عەقیدەی مرضیە ی مەولەوی ، مامۆستا فاتح عبدالکریم المدرس لەپەراوێزی ژمارە(٨)داو ل(٢٣)لەشەرحی عقیدەی مرضیە کە ی باوکی بەڕێزیدا دەربارەی ئەم کتێبەی بابە عەلی ئەفەرمووێ: کتێبێکی تازەیە لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی بەڕێز بابە عەلی شێخ عومەری قەرەداغە ، ساڵی ١٩٨٥ لەچاپخانەی ئیرشاد لەبەغدا. لەچاپ دراوەو(١٥٨)لاپەڕەیە. لەم کتێبەدا وەك نووسەری بەڕێز خۆی لەپێشەکیەکەیدا دەڵێت: (نزیکەی دەیەکی عەقیدەکەی هەڵبژاردوەو لێکی داوەتەوە. لەڕاستیدا کتێبێکی بەنرخەو نیشانەی ماندووبوونی نوسەری پێوەدیارەو، بەهەموو شایانیەکەوەچوەتە ریزی پێشەوەی ئەو رەنجانەی تائێستا دراوون دەربارەی بەرهەمی حەزرەتی مەولەوی).

دووەم کتێبیان لەچەند قەصیدەیەکی مەولەوی ئەکۆڵێتەوە، تیایدا بلیمەتی مەولەوی پیشان ئەدا، دەربارەی کتێبی یەکەمیان دیسان فاتح عبدالکریم لەسەر چاوەی پێشوودا لاپەڕە(٨٤٥) لەژێر ژمارە(٣) دا ئەڵێ: (لێرەدا نابێ ئەوە پشتگوێ بخەین کەبرای بەڕێز شێخ بابە عەلی کوڕی مامۆستا شێخ عومەری ئیبنولقەرەداغی-من پێ بزانم-یەکەم کەسە ئەوەی نوسیوە کەنیوەی دووەمی بەیتی عەقیدەی مرضیە کەی بەحسابی حروفی ئەبجەد ساڵی لێبوونەوە لە دانانی ئەگرێتەوەو، ئەمەی لە پەراوێزی لاپەڕە(١٥٢)ی کتێبەکەیدا (هەڵبژاردەیەك لە عەقیدەی مە رضە ی مەولەوی ) نووسیوە.).ئەم بلیمەتە وەکو لەپێشەوە باسم کرد سەردەمێك زۆر شەیداو سەرقاڵی مەولەوی بوو، لەمکاتەیدا زۆر زۆر یارمەتی مەعنەوی منی داو، زۆر گیروگرفتی

لەبەردەممدا لابردو، نهینیەکانی مەولەوی بەشیوەیەکی زانستیو لیهاتوانەوە بۆمی روون ئەکردەوە. وەلەلایەکی کەشەوە هانی دەدام بۆ بەردەوام بووم لەسەر کارەکەم .بەڵام لەپرئەم پیاوە پایەبەرزەرووی لەئەدەبیاتی مەولەویی وەرگێڕاو بەتەواوی پشتی تێ'کرد،بەپێچەوانەی جارانیەوە لەهیچ دانیشتنێکدا نەمدی و نەمدی باسی مەولەویو ئەدەبی مەولەوی بکات ولێی بدوێ.وەهەروەها وەك رووی لەمەولەوی وەرگێڕا—ئێستاکە بەرانبەر بەمن ئەوبەزەییو میهرەبانەی نەماوە کەجارن لەگەڵ مندا هەیبوو لەدڵی خۆمدا بەووردی لێکی ئەدەمەوە نەك تەنیا بەئاشکرا —بەڵکو بەخەون و خەیاڵیش پەی بەو هۆیە نابەم، لەوانەیە—خوانەخواستە—زووشتی بەرانبەری بووبێو من دەرکی پێنەکەم،منیش لەلایەن خۆمەوە ئەڵێم : ( هەتا یاساو دەستوری خوێندنی عێراقی پۆلی شەشەمی عیلمی ببڕێت بەبێ ئەوە—وەکو من ئگادارییم هەیە لەژیانی ڕۆژانەی —بچێتە قوتابخانەیەك وەیا لای زانایەك دەرسی خوێندبێ و چۆکی بۆی دادابێت. لەساڵی (٦٣)دا بەفەرمانی زەعیم صەدیق و بەهەزاران دانیشتوانی سلێمانی لەهەمە چەشنەیەك خەڵك گیرابوون، من وبەرێزیشی لەوکۆڕوگرتنەدا بێبەش نەبووین، جارێکیان لەوەڵامی پرسیارێکدا وتبووی من ماموّستام (راستە لەو کاتەدا ماموّستابوو) دوابەدوای ئەوە وتبووی من قوتابی و لەپۆلی شەشی دواناوەندیم، لەسەرئەوە گواستیانەوە بۆ ئیستەپڵەکە (جێی ئەسپەکان) . لەو کاتە نالەبارەو لەوشوێنە ناسازەدا ئیمتیحانەکەی تەواوکرد، ئەنجامەکەی ئەوەبوو(٧٥)هێنابوو. بەداخەوە بەخت و ناوچەوانی هاریکاری نەکرد بچێتە زانکۆو پلەی بەرزبهێنێو سەری میللەتەکەی بەرز بکاتەوە گیانم لەقەفەزدایەو هەناسەم هاتوچۆ ئەکا هەرهمان هەڵقە لەگوێی ئەم خۆشەویستەبێ وێنەیەم. بەڵام جارێك بەشێوەی ئاڵۆزی رووی تێکردم وفەرمووی:من لەبەرگی یەکەمی مەولەویدا زۆر یارمەتیت لەمنەوە بینی، لەگەڵ ئەوەشدا ناوی منت نەهێناوە...) وتم راستەو مافی خۆتەو گلەەکەت لەسەرسەرمە خوای گەورەو باڵادەست ئەیزانێ ئەم زاتەم بیر نەچوو، ئەوەی ئێستا نوسیومە زیاترم لەسەرنووسیبوو بەڵام بەهۆی گیروگرفتەکەی چاپخانی (خلود) ەوە نوسیەکەی ئەم و شێخ عبدالعزیزی پارەزانی رووناکیان نەبینی و لەوبەرگەدا بڵاونەکرانەوەە. بەخواست وئیلهامی دڵم حەز ئەکەم زیاترو چڕوپڕتر لەم بلیمەتە بدوێم، ئەم ناوازەیە—خوابیهێڵێ'—زیرەکی و زەکاوەتەکەی سنوورنەناس و بێ مەرزە، لەماوەیەکی زۆر کەم وکورتدا هەموو باتە

زانیارانەی ١٢تا١٤ساڵدا بەفەقتی تەواویان ئەکرد، ئەم ئالأبەرزە لەماوەی پێنج وشەش ساڵدا بەتێکەشتنەوە گەیاندیە کۆتایی.

١٠-دکتۆر صەدیقی موفتی زادە: ئەم زاتە کوڕی زانای بەناوبانگ مەلاعبداللە ی (دشە) یىیە، واتە برای مەلا مەحموودی موفتیی شاری سنەیە، وەمامی شەهید کاك ئەحمەدی موفتی زادەیە. ئەم زاتە خوێندنی مەلایەتیی تەواوکردوەو، لەدوادا لەدانشگای تاران دەرچووەو پلەو بڕوانامەی دکتۆرای وەرگرتووە.من لەسەرەتای خوێندنەمەوە لەلای ئەم بەڕێزە خوێندوومە، دیوانی مەولەوی کۆکردبۆوەو شەرحێکی باشی لەسەر نووسیبوو،چەند نوسخەیەکی دەست خەتی لابوو، بەشێوەیەکی جوان نووسیبوویەوەو ئامادەی کردبوو بۆ چاپ و بڵاوبوونەوەی، بەڵام بەداخەوە بۆی هەڵنەسوڕا ئەو پرۆژە بەنرخەی بدا لەچاپ، ئیتر خۆی ماڵاوایی لەدنیاکردو نەمزانی دیوانەکەی چی بەسەرهات؟

١١-مامۆستای بەڕێز صەدیق بۆرەکەیی(صەفی زادە): ئەم زاتە زۆر و لەسنوور بەدەرعاشق وشەیدای ئەدەبی مەولەوی یە، ئەم پایەبەرزە بەدڵسۆزی و زانایانە و لێهاتوویی دەستی داوەتە نووسینی ووێژەی فەرەنگی کوردی، لێرەولەوێ توانیویەتی دەیان شاعیرو هەستیاری کوردی بخاتە قاڵبی کوردەوە و زیندوویان بکاتەوە، لەڕووەوە نووسینی زۆرەو کردارەکانی جێی شانازە، خوابیهێڵی و پایەداری بکات بۆئەمە گەلە کڵۆڵ و لێ قەوماوە. بەڕیزیان لەدیوانەکەی میرزا یەحیای کوردستانیدا کەلەساڵی١٣٦٩دا لەچاپخانەی حەیدەری بەچاپی گەیاندووە،لە(ل:٣)دادەربارەی مەولەوی ئەفەرموێ: (..مەولەوی یەکێ لە هۆنەرانی هەرەبەرزی کوردەو هەتا هەتایەلە ئاسمانی ووێژەی کوردەواریدا ئەدرەوشێتەوە، ئەو لەزانیاری ئان و ووێژەو پیتۆڵیشدا شارەزاو پسیۆڕ بووەو لەم بارەوە گەلێ نووسراوی بەکەڵکی بەزمانەکانی فارسی و عەرەبی داناوە کەهەندێکیان لە چاپ دراون..گەلێ شیرین و تەڕو پاراووناسکن و کەمتر هونەرێك توانیویەتی بەو تەڕو پلراوەیە هۆنراو بهۆنێتەوە).

١٢- میرزا یەحیای کوردستانی: مامۆستا صدیق بۆرەکەیی(صەفی زادە) دەربارەی ئەم دیوانە-لەپێشەکەکەیدا-ئەفەرموێ: (ئەم دیوانە کەبەژمارەی٣٩٩٦/٣لەپەرتووکخانەی زانستگای تاراندا پارێزراوە، لەدەوری مەولەوی (١٢٢١-١٣٠٠-ك)دا بەهۆی هونەرێکی کورد بەناوی یەحیای کوردستانەوە

نووسراوەتەوەو هەندێ پەراوێزیش بەزمانی فارسی و کوردی لەلایەن مەولەوی و نووسەری نوسخەکەوە بۆ هۆنراوەکان نووسراوە.. نوسخەکە نوسخەیەکی ڕێك وپێکەو،نوسەرەکەی گەلێ بەتەنگیەوە بووەو لەژێر هۆنراوەکاندا هەندێکیانی نرخاندوە وەك ئەلێ:((بەخ بەخ )).((هەتاخوار چلۆنە مەرگی من)) .((هەی هاوار لەمە)) .((نازك بەیتە)).((سوبحانەڵلاّ لەم بەیتە)). ((ئەیرەحمەت)). ((ئەڵلاّهو ئەکبەر لەم بەیتە)).( (تێ فکرە چ حشرێ دەکا)).((ئەی چ دەکا)).((توخواچ لۆنە)).مامۆستا صەدیق لەسەری ئەرواو ئەڵی: ((نوسەر وەکو خۆی لەپەراوێزی دیوانەکەدا ئەڵێ: ((دیوانەکەی لەڕووی نوسخەیەکی دەستنووسی مەولەوی نوسیوەتەوەو چەند نوسخەیەکی تریشی لابووەو جیاوازیەکانی ئەو نوسخانەی لەسەر هۆنراوەکان نووسیوەو مانای هەندێ وشەی وەکو:ما فەتە،واژاوش، وەرکەمەر، چنوور، رەزەن))ی لەسەر هۆنراوەکاندا نووسیوەو لەکۆتایی نوسخەکەدا شێخ عبدالرحمان ناوێك پارچە هۆنراوەیەکی مەولەوی بەخەتی خۆی لەساڵی١٣٠٤ی کۆچیدا نووسیوەو کۆتایی بەدیوانەکەی مەولەوی هێناوە..وەمامۆستا صەدیق لەسەری بەردەوامەو ئەڵێ ( گرنگترین وبایی دارترین نوسخەی دەستنوسی دیوانی مەولەوی هەر ئەم نوسخەیە یە کەلەبەردەستتاندایەو لەدەوری مەولەوی نەمردا نووسراوەتەوە...)ل (١)و(٢)پێشەکی. پشت بەخودا لەبەرگی سێهەمدا من سوود لەم دیوانە وەرئەگرم.

## تێکەڵ و پێکەڵ بوونی دیوانی مەولەوی و ئاڵۆزەکانی

مەولەوی وەك لەزەمانی خۆیدا-بەرەغمی نەبوونی چاپەمەنی-پاش خۆشی ناوی لەزۆر ناوچەکانی کوردستاندا بڵاوبۆتەوەو بەشێوەی سیحراوی کاری کردۆتەوە سەردڵ ودەروونی ئەدەب ناسان، بەم بۆنەیەوە بەدەیان بەڵکو بەسەدان دیوانەکەی دەست بەدەست و یەك لەدوای یەك نووسراوەتەوە، ئەمەش دیارە شێواوی و ئاڵۆزی پەیدا ئەکا،ئەبینی لەهەندێ نوسخەدا چەند بەیتێك-زۆر یا کەم-پارچەیەکی سەربەخۆیەو لەهەندێ تریاندا ئەو پارچەیە بەچەند پارچەی جیا جیا ئەکەوێتە بەر چاو، وەبەپێچەوانەشەوە لەزۆربەی دیوانەکاندا ئەم گێژاوو ئاڵۆزە ڕەچاوئەکرێت. لەلایەکی کەشەوە ووشەیەك بەووشەیەکی ترو ڕستەیەك بە ڕستەیەکی تر سەرهەڵئەدا، ئەمەش دیارە ئەبێتە هۆی تێکچوونی مەعنا و، بۆنموونە بڕوانە بەیتی یەکەم لەقەصیدەی (ساقی ئاوەردەو ) لەلاپەڕەی(٢٩١)ی دیوانی(ع،م) لەوێدا(ووریا) نووسراوە کەبەمەعنا خواردنە لای ،(ف) (دەریا)یە، ئەمەش دیارە ڕەوتی مەعناکە تێك ئەدا. بۆیە ڕاڤەکەران ئامارە ئەکەن بۆ ئەم گۆڕانکاریانە .

**محمد امين حبيب سعيد**

**ئەردەڵانی**

**درروودو ستایش** [1]

**هەورمكەی ڕەحمەت رووی سەمای كەرەم**

**( صلاة ) و( سلام ) اكەی كەم؟ ئیسەكەم**

**بێرێ و برێژێ بدا وەهەمدا**

**وەسە رمەزرعەی ڕۆحی خاتەمدا**

**سەروازكا سەراو وەهەر شەتاودا**

**وەسەر زەوی پاك ئال و ئەصحاودا**

**تابدا وەپڕتەو وەسەر وجوودا**

**( ئیمان ) لەئەسرار ئەهلی شهوود دا**

**جەو مەوزەعە نوور جۆش دا سەرە و ژوور**

**كوردستان پڕكا جە تۆفان نوور**

**بەو نوورەی ( ئوممی ) ش كەردەن وە ( اعلم )**

**كتێبخانەی چەن میللەت وەهەم** [2]

**بویەرۆ بەرقش جە كۆی كوردستان**

**ڕزگار بین جە دەس نادان وە ئاسان**

---

[1] ئەم قەصیدەیە لە دیوانی (ئەصل و ڕۆح) ەكەی پیرەمێرد وەرگیرا، بەیتی یەكەم و دووەم و سێ یەم و چوارەم لە دیباجەی (عەقیدەی مەر ضی ) یەكەی خودی مەولەویدا بەو دەقەوە هەیە.

[2] —(امی– ئۆمی) : نەخوێندەوار. (اعلم): زاناتر. مەبەست لە (ئۆمی) پێغەمبەرە (درروودی خوای لەسەر بێ). واتە خوای گەورە بەو نوورەی خۆی پێغەمبەری نەخوێندەواری كرد بە زاناو داناترین ئادەمی، سروشی بۆ ناردو سەری خست بەسەر هەموو ئانەكانی ترداو بە شەریعەتەكەی شەریعەتی كۆی میللەتەكانی تری (نەسخ كردەوە).

لەم ڕووەوە دەربارەی پێغەمبەر(درروودی خوای لەسەر بێ) مەولەوی لەبەیتێكدا ئەفەرموێ:

لەمە موعجیزە عەجیبتر (مەشنەو):

(امی) و عەللامە هەتیو بەئەدەو

وشەی (مەشنەو) واتە مەبیستە. ئەدەو: ئەدەب واتە : موعجیزە لەمەگەورەتر هەرگیز نابیستی: مرۆڤێك هەتیوبێ و لەو پەڕی ڕەوشت بڵندی و ئەدەب بەرزیدا بێ، وەیاخود ئۆمی بێ و لە هەمانكاتدا لە عیلم و زانستدا بلیمەت و سەراوورد بێ.

**هەورامی ( ٠ )**[١]

**ئەی گرد ( مەوجودێ ) جە تۆ گرت مایە**
**پەیدا هەر تۆنی( ماسیوا ) سایە**[٢]
**پەنهان بی تەنها ( وەحدەت ) مەوج ومرد**
**پەی شنا سایی ( ظهور ) یۆەت کەرد**[٣]

**سۆرانی ( ٠ )**

**بۆ هەموو بونێ تۆ بوی بەمایە**
**پەیدا هەر تۆیت و( ماسیوا ) سایە**
**پەنهان وتەنیا، ( وەحدەت ) مەوجی دا**
**بۆ ناساندنت ( جیلوە )ت دەمی دا**

---

(١) بەم قەصیدەیەو چەند قەصیدەی دوایی لەخوای گەورەو میهرەبان دەپاڕێتەوە.

(٢) واتە ئەی خوایە! هەرچی بوون و بوونەروەر هەیە لەم بوونە فراوانەدا تۆ بەتوانای خۆت گیانت کردووەبەبەریاندا، پەیداو نەمر هەرتۆیت و، بێجگە لەتۆ هەموو بونێك وەك سێبەر وایە.

(٣) (وەحدەت) ، (م): (وەحدەتت) . بەڵام کێش و وەزنی بەیتەکە تێك دەدا. واتە: پێش دروست کردنی ئەم بوون و بوونەوەرە، تۆ تەنها و پەنهان بووی، بۆئەوەی بناسرێت– وەیا بۆ هەر ئەنجامێ تر کەهەر خۆت دیزانی– لەپڕ ئەو (وەحدەتە) ت شەپۆلێکی داو بوونەوەرت دروست کردو خۆتت پێ ناساندن. کەواتە ئەم بوونە کە شوێنەواری پەنجەی تواناتە سەرەتاو کۆتایی هەیە، بەڵام تۆی مەوجوود و ڕاستەقینە نە سەرەتات هەیەو، نەکۆتایی.

بەوێت جەی عالەم بێ بەقای (ناسووت)،
ئەر وەی گرد (جیلوە) ی وەرین ئەشناسووت [٤]
بەسەد (جیلوە) ی تەر-بێچوون و چەنی-ا
شناسایی تۆم نمە بۆ هەنی [٥]
سەر وەشم بەی وەسف جەمالیتەوە
باز هەم بەی جیلوەی جەلالیتەوە [٦]

من لەم دنیایەی بێ بەقای (ناسووت)
ئەتناسم گەر بەم گشت (جیلوە) ی پێشووت ؟
بەصەد (جیلوە) ی تر-بێ وێنەو مانەند
بەناسینی تۆ نابم بەهرەمەند
مەستم بەوەصفی (جەمال) یتەوە
دیسان بە جیلوەی (جەلال) یتەوە

هەورامی(١)

ئەو-هەر بەو عادەت سەر وەش نیگاران
پەی فەنای یەکسەر خاتر پڕ خاران [٧]
چار نی یەن جەدەس : (جیلوە نەکەردەن)
(بسم الله) ها تێغ ئێد کە چیی گەردەن [٨]

سۆرانی (١)

گەر – هەر بەو ڕەویەی سەرخۆش نیگاران
بۆ فەنای یەکسەر دڵ پڕ لە خاران
چار نی یە لەدەس : ((جیلوە) نەکردن)
فەرموو ئەو تیخ (ها کەچیی گەردن

(٤–٥) (ناسووت) : جیهانی ماددە. واتە: ئەی خوایە ! ئەگەر من بەم گشت بەڵگانە و بەو هەموو دەرکەوتنانەی پێشووتەوە نەتناسم ؟ ئاشکرایە بەسەدان ( جیلوە) ی ترو دەرکەوتنی ترت ناتناسم، هەموو گەردیلەیەکی بوون– دەلیل و بەڵگەی بوونی تۆیە.
وشەی (بێچوون وچەنی) یا (بێچوون و چرا) : بە بێ قسەو بە بێ دەلیل.

(٦–٨) بەی : (ف)و(پ): وەی. (م) : باز هەم بەی. ف وپ: بازەم وەی. م: چارنی یەن، ف: چارەنیێن.
(جەلال): صیفەتی قین و قارە.(جەمال) : دڵنەوایی و میهرەبانی یە. واتە خوایە! من مەست و شەیدای (جیلوە)ی (جەلال) و (جەمال) تم. مانەوەم بە تەنیا بەم دوانەوەیەو. هۆی خواستم ئەوەیە ئەو (جیلوە) یەت لەمن ئاوا بێ. جانەگەر –بە شێوەو ڕەویەی (سەرخۆش نیگاران) و ئەوانەی کەلەو پەڕی جوانیدان و بۆ لەناوبردنی عاشقانی دڵ پڕ لە خاران– چار نی یە: لە (دەست (جیلوە) نەکردن) ت ، ئەوە لەم کاتەدا فەرموو ئەوە تیغی تیژی تۆو ، ئەمەش گەردن کەچی من ولەناوم بەرە.

گێو تەر نی یەن داد وێم کەروون
جەدەس تۆ بێداد وەی کێ بەروون ؟ [٩]
واوەیلام بێ حەد زایم بێ شۆمەن
جەلای تۆ فەریاد جەدەس تۆمەن [١٠]

شوێنێ تر نی یە بکەم دادو رۆم
لەدەی تۆ هاوار بۆ لای کێ برۆم ؟
شینم بێ سنوور زاریم بێ ( شۆم ) ە
لای تۆ هاوارمە و لەدەستی تۆمە

**هەورامی ( ٢ )**

باعیس وجوود جە ماه تا ماهی
دلیل ئیسپات صونعی ئیلاهی [١]
(ضیا ) ی بینام ! نوور چەمانم !
سەر مایەی حەیات دین و ئیمانم !
من وێم مزانوو بێ ئەمریم کەردەن
ئیتاعەی فەرمان عەبدیم نەبەردەن
عومرم سەرتا پا غەرق غەفلەتەن
زاد ئاخر بار خەجلەتەن
بەلام مشێو تۆ وە فەزڵەکەی وێت
کردەی من نە بۆ بەهانە پەرێت
( اغماض ) کەی جەگرد نا بەکاریی من
جە رووی سیایی و بەد کرداریی من
پەی من کافی یەن ئەی گرد ( انفعال )
بۆ بە رەحم وێت بکەرەم پا ماڵ

**سۆرانی ( ٢ )**

ئاسمان و زەوی بە تۆ پەیدایە
بەڵگەی ئیسپاتی صونعی خودایە
سۆمای بینام ! نووری چاوانم !
سەرمایەی ژین و دین و ئیمانم ! [*]
ئەزانم من خۆم بێ ئەمریم کردی
بەندە فەرمانیم نەهێنایە دی
سەرتا پای عومرم نوقمی غەفڵەتە
توێشووی ئەو دنیام باری خەجڵەتە
بەلام ئەشێ تۆ بەگەورەیی خۆت
کردەی من نەبێ بە بەهانە بۆت
چاو پۆشی بکەی لە بێکاری من
لە ڕوو ڕەشیم و لەبەدکاریی من
من ئەوەم بەسە : کەشەرمەزارم
سادەی بەو ڕەحمەت بکە ڕزگارم

**هەورامی ( ٣ )**

مەدیە وە تۆمار کردەی و پەردەم

**سۆرانی ( ٣ )**

مەڕوانە کردەی پێشووی تۆمارم

---

[٩] (م) : (کەروون) ؛(بەروون) (ع) : کەردەن، بەردەن، واتە : جێگایەکی کە نی یە تیایدا سکاڵای خۆم بکەم و پەنای بەرمە لاو شکاتی تۆی لەلا بکەم.

[١٠] واتە : شین و واوەیلام زۆرو بێ سنوورە، هاوارم هەر لای تۆیە و لەدەستی تۆشە.

[١] ماه : مانگ. ماهی: ماسی. مەبەستی هەموو ئاسمان وزەوی یە، لەسەر ئەو ئەفسانەیە دەڕوا کەدەڵێ: زەوی بەسەر ماسی یەوە وەیا دەریا بەسەر گایەکەوە ڕاوەستاوە.

[*] سۆما : ڕۆشنایی

بدیە وە زەردیی ڕوخسار ئاوەردەم [*]
هەرچەند شایستەی عەفووت نەداروون
ڕووی شەرمەندەگی وە دەرگات ماروون
جە بەحر کەرەم بێ بەشم مەکەر
شەڕ نەفسانی جە ڕاگەم لابەر
تا بە ( فضل ) وێت بوا نیمەوە
جەدەس هەوای نەفس بسانیمەوە
بەڵکم جەی ئاخر پەی وێم فکرێ کەم
ئەدارەك پەی چەند ئەزبێح زکرێ کەم
بەڵام بەو شەرتە چەنێم قبووڵ کەی
بەهانەی ئەسپاب عەفووم ( وصوڵ ) کەی

بروانە ڕەنگی زەردیی ڕووخسارم
هەرچەند نەشیاوی عەفوە: بەندەم
لەدەرگات دەسووم ڕووی شەرمەندەم
لەدەریای کەرەم بەشم کەرەم کەی
لە شوومی شەڕی نەفس چارەم کەی [*]
تا بە فەضلی خۆت بمخوێنیتەوە
لەدەستی نەفسم بمسێنیتەوە
لەم دەمەی دایی بەڵکو فیکرێ کەم
بۆچەند تەزبێحێ بۆخۆم زیکرێ کەم
لێمی وەربگرێ بەڵام بەمەرجێ
هۆی لێ بووردنم بکەی جێ بە جێ

هەورامی( ٤ ) [1]

نەفس بەدکردار ! بی دین و بەد بەخت !
شووم سەرگەردان خەیاڵان سەخت [2]
پەی چێش عادەتت وە گوناه کەردەن ؟
ژار مەحروومیی ڕەحمەتت وەردەن ؟ [3]
ڕاگەی حەقیقەت جە ویرت شی یەن
یادت پەی مەحبووب حەقیقی نە یەن [4]
مەوتەن ئەصلیت نە خاتر لوان.
مێخ مۆبەتت نەڕووی خاك کوان ! [5]

سۆرانی( ٤ )

نەفسی بەد کردەی ! بێ دین و بەد بەخت !
شووم ودووکەتەی خەیاڵانی سەخت !
بۆ گوناه کردن بۆ تێ دەکۆشێ ؟
ژاری مەحروومیی ڕەحمەتت نۆشی
ڕێی حەقیقەتت لە بیر بردەوە
کەی بەیادی دۆس دڵت کردەوە ؟
مەیلی جێی ئەصڵیت نەما لەدڵدا
مێخی دڵسۆزیت کوتا بە گڵدا

---

(*) تۆمار : لێرەدا مەبەست پێی کردەوەی ئەعمالە.

(*) زاڵ بوونی نەفس و ئارەزوو سەرچاوەی هەموو گوناهێکە ، خوالاماندا.

(1) ئەم چامەیە لای(م) بەشێکە لەچامەی پێشوو . بەڵام ڕاست وایە. وەك لەهەندێ نووسخەدا هاتووە. دوو چامە بن .

(2) ڕوو دەکاتە نەفسی خۆی و تانەی لێ دەدا.

(3) واتە: بۆخۆت گرتووە بە گوناه و خراپە کاری یەوە؟ بۆتۆژاری مەحروومیت خواردۆتەوە ؟

(٤-٥) وشەی (حقیقی) خەبەرە بۆ (یادت) ، وەیا دەبێ بە صیفەتی (مەحبووب) واتە: یادت بۆ مەحبووب حەقیقی نی یە ، وەیا بێ گەردی مەحبووبی حەقیقی ناکەی.

دیام گرفتار ئارەزووی خامی
یەکسانەن پەرێت نێکی و بەد نامی
گا خەریك دەرد هەوای مەجازی
گا مەشغوول کەسب کیبر و نیازی
گا غەرق هەوای وەسڵ ئازداری
گا حیرەت زەدەی ڕوخسار یاری

هەمیشە بەندی ئارەزووی خاوی
یەکسانە لە لات : چاکی و بەد ناوی
دەمێ سەرگەرمی هەوای مەجازی
یاماندووی دەردی ( کیبر ) و نیازی
گا نوقمی هەوای وەصڵی ئازداری !
گا سەرگەردانی ڕوخساری یاری !

هەورامی ( ٥ )

هیچ هۆشت نی یەن حەق خەبەردارەن
فەردا ڕۆی حیساب میزانەن کارەن
فکرێ کەرەوە وادەی لواتەن
وەخت شێویای شەوق سەوداتەن
با وەرە وەدەس زادێ پەی سەفەر
وێت نەو سەفەردا بێ تۆشەمەکەر
وە دەرگای حەق بەر ڕووی پەشیمانی
عوزراوەری کەر کردەی نادانی
بەڵ لیباس عەفوو بکەرۆت نەجات
جەوەخت مەردەن بدەرۆت نەجات
وە نسیوت بۆ سەرمایەی ئیمان
نەوی وە ڕیشخەند سوخرەی شەیتان
وە ڕووی مەحشەردا بگێلی دڵشاد
جە قەید ( عصیان ) دڵت بۆ ئازاد [٦]

سۆرانی ( ٥ )

هیچ هۆشت نەما : خوا ئاگادارە
تەرازووی ڕۆژی دوایی لەکارە
بیرێ کەرەوە کورتی مەوداتە
کاتی تێکچوونی شەوقی سەوداتە
توێشوویێ دەسخە بشێ بۆ سەفەر
بێ توێشوو ڕێگای سەفەر مەگرە بەر*
هەڵسوو لەدەرگا ڕووی پەشیمانی
عوزر خواهی کە کردەی نادانی
بەڵکو لێ بوردن بکا بە خەڵات
ڕزگارت بکا دەمی گیانەڵات
بتداتێ ئیمان بێ دەردی سەری
لەگاڵتە و کەمەی شەیتان بێ بەری
لە ڕووی مەحشەردا بگەڕێی دڵشاد
لە کۆتی گوناه ببی دڵ ئازاد

هەورامی ( ٦ )

دڵە ! ڕاگەکەت خەیلێ تاریکەن

سۆرانی ( ٦ )

دڵە ڕێگاکەت گەلێ تاریکە

---

* مەبەست لە تێشوو کردەوەی باشە.

[٦] وەڕووی مەحشەردا: واتە بەسەر ڕووی مەحشەردا، (م): وەڕۆی مەحشەردا واتە: ڕۆژی حەشر و قیامەت.

پردەکە سەختەن خەیلیٚ باریکەن [1]
سارای هیدایەت تاریك مەوینوون
رای نەجات یەکسەر باریك مەوینوون [2]
چۆنە چراویٚ پەریٚ ویٚت سازدەر
وەقەد توانای ویٚت بار بەندی کەر
ئەر گونا رای ڕاس بەردنی جەویر
شوٚن پای کردار هام فەردان هوٚرگیر
بەڵ لەو دیواندا- دیٚوانەی سەرشیٚت !
خەجاڵەتی بەزم یاران ئەیوٚییٚت

پردەکە سەختە خەیلیٚ باریکە
دەشتی هیدایەت تاریك ئەبینم
ڕیٚگەی ڕزگاریت باریك ئەبینم
چرائیساز کە ڕیٚی پیٚ بروانی
توێشوو هەڵبگرە هەتا ئەتوانی
گەر لەڕیٚی ڕاستی لای داوی تاوان
بگرە شویٚنی پیٚی کردەوەی پیاوان
تا لەو دیواندا-دیٚوانەی سەر شیٚت !
ڕووزەردیی بەزمی یاران ئەگا پیٚت

هەورامی ( ٧ )

باری ئەو غەفڵەت دام تەندەن ئەڕیٚت
نی یەنی وەتەنگ شەرمەساریی ویٚت
یاد ئەو سەروەر وە دەروون باوەر
ئەروا چان پەنەش ئەو بەزم مەحشەر
یە مەنسووب تۆن ئینە کردەشەن

سۆرانی ( ٧ )

گەر غەفڵەت لەڕیٚت داوی تەنیوە ؟
هیچ نیت بەتەنگی شەرمەزاریوە
بە دڵدا بیٚنە یادی ئەو سەروەر
ئەگەر پیٚی بڵیٚن لەو دەشتی مەحشەر :
ئەمەسەر بەتۆ و کرداری ئاوا !

---

(١-٢) (م) : خەیلیٚ ، (ك) : یەکجار.

چەند شتیٚك هەن وەك تاریکی و باریکی پردو سەختی دەشتی هیدایەت.. لەڕیٚی مەولەویدا ئەبن بە کۆسپ ، بەپەیدا کردنی (چرا) و (توێشوو) و (دواکەوتن) ی مەردانی خواناسان چارەسەر دەکریٚن.

پیٚغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویٚ: (پردی صیراگ) لەموو باریکترو لە ئەڵماس تیژ ترە ، ئەم فەرموودەیەی، وەکو من تیٚی تیٚگەیشتووم پری ڕاستەقینە نی یە . بەڵکو مەبەستی پیٚی شەریعەتە، چواندنی (معقول) ە بە (محسووس) ەوە، ئەگەر وانەبیٚ ، دیارە ئیٚمە تیٚی ناگەین و پیٚویستە بڕوامان پیٚی ببیٚ، زۆر مەسەلە هەیە لەعەقڵی تەسکی ئیٚمەوە دوورە . مەولەوی لە (عقیدە مەرچی ) یە کەیدا دەفەرمویٚ:

پردیٚکە بەسەر دۆزەخدا هەموو
تیژ تر لە شیرو باریکتر لە موو
بۆ تەوای خەڵك یەکسەر مەعبەرە
نموونەی ڕیٚگەی شەرعی ئەنورە
توولی پیٚ نەدەین نیتر گفتوگۆی
وا بە مدا دەڕۆی ، بەواش وا دەڕۆی

چەنی تواناش سەر هۆر دەردەشەن
ئەو بە شەرمەوە مدیۆ بە وەردا
من مشێو کام خاك کەروون وە سەردا ؟ [۳]
ئیسە موویىنی چێش پەنەم ئامان
هانا هاوارەن های نەیچی ! ئامان !!

سەر چۆن هەڵئەبڕێ سەرداری ئاوا!!
ئەو کە داینەوان سەری لەشەرما
من ئەبێ کام خاك بکەم بەسەرما ؟ !
ئێستا دەمبینی بەم تەرزە زەلیل
هانامە ، هاوار، های ساقی دەخیل!

**هەورامی ( ٨ )**

جفت مەعصیەت جە تاعەت تاقم
ڕووسیای مەجلیس جەرگەی عوشاقم
بینای وجوودم خەجڵەت ئەساسەن
بەختم موخالیف ئامەدیم ڕاسەن
سەبای هەناسەم ئەدەروون سەد تەرز
کەردەن کلپەی ئار ئیبراهیمی بەرز [٤]
پە نجەت بەو نەغمەی بێن بە تینەوە
باوەرە ئەی بەیت وە حەزینەوە: [٥]
سەهلەن من ڕوو زەرد سەر ئەوەرنان
ئای مایەی ( تصدیع ) پێغەمبەرەنان !

**سۆرانی( ٨ )**

جووتی تاوانم لە تاعەت دوورم
ڕووڕەشی جەرگەی کۆڕی حضوورم
شەرمەزاری یە بناغەی هەستیم
بەختم ئاوەژوو ، ڕاستە نەهاتیم
ها ، بای هەناسەم لە دڵدا سەد تەرز
کلپەی ئاگری خەلیلی کرد بەرز
پە نجەت لەسەر نەی بێن بە تینەوە
ئەم بەیتە بێژە بە حەزینەوە
سەهلە ڕوو زەردی و سەر شۆڕی و حەسرەت
ئای بووم بە مایەی سەر ێشەی حەزرەت!

**هەورامی ( ٩ )**

دڵە !وەر دەی نەفس گوناه ئاوەردە
سیفەت ئەڕووی ( ذات ) وە پەردە کەردە [١]

**سۆرانی ( ٩ )**

دڵە ! بردووی نەفس گوناه ئاوردوو
سیفەت لە ڕووی ( ذات ) بە پەردە کردوو

---

[۳] (م): مدیۆ. ك: بدیۆن.

لەناوەرۆك و مەفهوومی ئەم بەیتە و بەیتەکانی پێشەوەدا تەعبیرێکی دڵتەزێن ڕوخسار دەکێشێ بەخوێندنەوەی و تێگەیشتنی مرۆڤی موسڵمان دەکەو ێتە جیهکێ سامناك و پڕ لە مەترسی یەوە بەم تەرزەو بەم ڕێبازە ناسکە مەولەویی داهێنەر باسی زەبوونی و کەساسیی خۆی دەکا بۆ دڵی.

[٤] (م):صەبای هەناسەم. (ف): سیای هەناسەم. واتە: ڕەشیی هەناسەم.

[٥] لەبەر کەساسی و زەبوونی خۆی هانا دێنێ بۆ نەیچی کە بە ئاوازی کاریگەری نەیەکەی و بینی بە تینەوە بەیتەکەی داوەوەی بۆ بلێ . بەڵکو بکەوێتە جیهانێکی کەوە. وشەی (حەزینەوە) صیفەتە بۆ نەیچی . واتە: بەحەزینی و دڵتەنگی و خەفەتباری یەوە ئەم بەیتەم بە ئاوازەوە بۆ بڵێ.

منیچ بەو مەیلە دنیام وەکام بۆ
نەك غەزال ئاسا دیا و رەمت بۆ
ئیتر کافی بۆ جەورو جەفاکەت
بەڵ تاوەسەر بۆ مەیل و وەفاکەت
ئەر چەند هەفتەیێ عومرم مەندە بۆ
بەڵکم دووری تۆ لیم نەسەندە بۆ

منیش بەو مەیلە دنیام بە دڵ بێ
نەك ئاسك ئاسا بڕوانی و ڕاکەی
بابەس بێ ئیتر سزاو جەفاکەت
بەڵکو تاسەر بێ مەیل و وەفاکەت
گەر چەند هەفتەیێ عوومرم بمێنێ
بەڵکو دووری تۆیمی نەسێنێ

هەورامی ( ٥٠٩ )

ئازیزم ! ئاهیر دووری بالاّیتۆ
جەستەی کەرد وە بووڵ شەماڵ بەرد پەی کۆ
ورشەپیرشەی تاو کورەکەی جەستەم
شەرارەی لوولەی پێشەی شکستەم
گەرمەو پزیسکەی چەخماخەی پارە
بەرق و بریسکەی شوعلەی شەرارە
شاخەی شریخەی بروسکەی دەروون
نەچەم شەتاوان جاری کەرد چون چون
مەوج مدۆ لافاو هوون دیجلەی دڵ
نەفوارەی چەم هۆر شانۆ گڵ

سۆرانی( ٥٠٩ )

ئازیزم ! گڕی دووری بالاّی تۆ
سووتاندی جەستەم بابردی بۆ کۆ
پزیسکەی جۆشی کوورەکەی جەستەم
شەرارەی لوولەی ئێسکی شکستەم
گرمەو پزیسکەی چەخماخەی بارەی
کڵپەو بریسکەی تیشکی شەرارەی
شاخەی شریخەی ئەعرەتەی تاو تاو
خوێناو وەك شەتاو جاری بوو لە چاو
مەوجی ڕاسەیلی خوێنی دیجلەی دڵ
لە قەڵبەزەی چاو وا هەڵنەدا قڵ

هەورامی( ٥١٠ )

کای دڵ نەگێج مەوج فەنادا
مۆڵەقەن نەبەین خۆف و ڕەجادا
تۆیچ ئینسافت بۆ هەنی وەسەن وەس
( باللە ) جە دووریت هابیم وەقەفنەس
تاکەی چون مەجنوون وێڵ هەردان بم؟
تاکە یخەمزە دەی بار دەردان بم؟
هەر ساتێ دوریت سەد ساڵەن جەلام

سۆرانی( ٥١٠ )

کای دڵ لە گێژی مەوجی فەنادا
مۆڵەق لەبەینی ترس و ڕەجادا
تۆش ویژدانت بێ ئیتر بەسەبەس
بەخوا لە دووریت ها بووم بە قەفنەس
تاکەی وەك مەجنوون وێڵی هەردان بم؟
تاکەی خەم زەدەی باری دەردان بم؟
هەر ساتێ دووریت سەد ساڵە لەلام

دەردم کاریەن، وەسەر گەرت بام
بەزییەت بەیۆ وەجەستەو حاڵم
ریشەم بەراما، هەرەس وەماڵم

دەردم کاریە فیدات بم هانام
بەزەیت بابێ بە جەستەو حاڵم
ریشەم هاتە دەر هەرەس بە ماڵم

**هەورامی( ٥١١ )**

نەمشەو تەنیابی جەستەی زەبوونم[١]
دیسان سەرواز کەرد دڵەی پڕ هوونم[٢]
خەیاڵانی خام هاوردم بەردم
هاوار جەدەمەی هەناسەی سەردم[٣]
زووخاو گێج مەدا دیگ دەرونم
هووناو هۆر شاناش جەستەی زەبوونم[٤]
ڕەنگا ڕەنگ گوڵ گوون هوونم
قرچەی برێشتەی کوورەی دەروونم[٥]

**سۆرانی( ٥١١ )**

نەمشەو تەنیایە جەستەکەی زەبوون
خوێن سەر ڕێژی کرد لە دڵ و دەروون
خەیاڵانی خاو هێنام وبردم
هاوار لە کزەی هەناسەی سەردم
گێژ ئەدا زووخاو مە نجەڵی دەروون
قوڵپی ئەدا خوێن لە جەستەی زەبوون
ڕەنگی جۆر جۆری سەیلی خوێنینم
قرچەی برژانی کورەی دەروونم

---

[١] بەبۆچونی من ئەم قەصیدەیە گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتوە.

[٢] تەنیا بی، پ.م: وەمەینەت.. سەروازکەرد: سەر دێژی کرد.. هوون: خوون، خوێن.

[٣] کەوتمە دەریایی خەیاڵانی خاوەوە ئەم هێناو ئەم بردو نە ئەگەیشتمە ئەنجام، هاوار لەکزەی بای ساردی زستانان.

[٤] مەنجەڵی دڵم زووخاوی گێژ ئەداو جەستەی زەبونیشم خوێناوی هەڵئەدا، ع.م لەکۆتایی نیوەی بەیتی یەکەم دا نووسیویەتی: (دەروونداا وەلە کۆتایی دووەمدا:(زەبووندا)ی نووسیووە. دیارە هەڵەی چاپە.

(٤) ع.م ئەم نیوە بەیتەی بەم جۆرە نووسیوە: (ڕنگا ڕەنگ، ڕەنگ گوڵ گوون هوونم).

(پ.م) لەجیاتی (گوڵ گوون هوونم) نووسیویەتی گ وڵ کوونەن هوینم. ئەوەی ع.م دیارە لەنگیپێك ئەدا بە بەیتەکە.

# دوونامەی پەخشان

# یەکەمیان بۆ:

# فەرهاد میرزای قاجاری

# دووەمیان بۆ:

# مەلا محمد صاڵحی ( فخر العلما )

**مەولەوی ئەم نامەیەی نووسیووە بۆ فەرهاد میرزای قاجاری [1] . وەئەمەش دەقی ئەو نامەیەیە :**

**( بسم الله الرحمن الرحيم )**

ربنا اغفر لنا ولاخوانا الذين سبقونا بالايمان ولا تجعل في قلوبنا غلا للذين أمنوا ربنا انك غفور رحيم. صدق الله العظيم. **ئەم ئایەتە پیرۆزەی سەرەوە وێنەیەکی ئەخلاقیمان بۆ دەنەخشێنێ و دەیخاتە رووەو موسڵمانانی پێوە بەند ئەکا، وەدەیکا بەسەر مەشق ورێگا پیشاندەری ژیانی**

---

(١) ئەم پیاوە یەکیکە لەشازادەکانی ئێرانی و مامی (ناصر الدين) شای قاجاری بووە، دوو جار ناوبەناو کراوە بە والی و فەرماندەی کوردستانی ئەردەڵان، مەردۆخ لە تاریخی (کوردو کوردستان) ە کەیدا بەدرێژی لەژیانی ئەدوێ و بە مرۆڤێکی ژیر و دانان وزانای دەدا لە قەڵەم ، لە هەمانکاتدا شاعیرو ئەدەب پەروەرو لەزانستە ئاییینی یەکاندا بەڵاو باڵا بووە، رقی لەدرۆ بووەو ڕاست گۆی زۆر خۆش ویستووە. بەرانبەر بە ڕەش و ڕووت گەلی بەبەزەیی بووە، دانیشتووانی سنەو دەوروبەری ڕزگارکردووە لە چنگی برسێتی و گرانی و لە سیاسەتی ڕازی بوون، بڕوانە (بەرگی دووەمی) تاریخی کوردو کوردستانی مەردۆخ.

ئەم پیاوە عاشق و شەیدای شیعرو ئەدەبی مەولەوی بووە، بەشاعیری (باڵاخانەی چەم) ناوی هێناوە ، دووجار لە پەنای گەشتەکانی جوانڕۆو هەورامان و مەریواندا سەری لێ ئەداو دیدەنیی ئەکات، فەرهاد میرزا لەسەر ڕێبازی شیعەو لە پەیرەوانی مەزهەبی جەعفری بووە، بەرامبەر بە ڕێبازەکەی سەراسەر خۆی بەحەق زانیوە، ویستوویەتی لەپەنای دادپەروەریی و فەرمان ڕەوایی یەکەیدا –لەرێگای زانایان و مەلایانەوە– مەزهەبەکەی خۆی بسەپێنێ بەسەر کوردەکانی ئەو ناوچەیەداو، بە شێوەی (تەبشیر) بیخاتە ناو مێشکیانەوە و بیکانکا بەجەعفەری.

بۆ هێنانەدیی ئەم هیوایەی نامەیەك ئەنووسێ بۆ مەولەوی و تیایدا ئەڵێ: ..ئیمامی عەلی صلوات الله علیەوسلامە– بەدەقی ئایەتی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر) لە هەموو یاوەرو یارانی پێغەمبەر گەورەترەو لەلایەن حەزرەتەوە (د.خ) بە جێ نشینی یەکەم دانراوە ن ئەم ڕاستی یەش لەسەردەمێکی تایبەتدا بە هێزو زۆری خێڵایەتی و ڕەگەز پەرستی یەوە کراوە بە ژێرەوەو، لە ئیمامیش لە ترساو وە بۆ بەربەستی لە خوێن ڕشتن و ئاژاوە ژێر پەردەی (تەقیە) دا بێ دەنگ بووە...

لەهەمانکاتدا بۆ پتەوکردنی ڕاکەی بە ناوی دیاری یەوە–بە پیاوێکی تایبەتدا– کتێبێکی بۆ دەنێرێ.. دانەری ئەم کتێبە لسەر ڕێبازەی سوننی و یەکێکی لە پەیرەوانی شافیعی (ر.خ) – وەلە نامەکەی خودی مەولەوی یەوە کە بۆ (فخر العلما) ی ناردووە دەردەکەوێ –بە (سبط) ی (ابن الجوزي) **بەناوبانگە (واتە کچەزای (ابن الجوزي) ) لە پاش خوێندنەوەی کتێبەکە لە ئەلیفەوە تا یای (ئەبینێ پڕە لە قسەی ناپەسەند و نەشیاو ، تیایدا ناڕاستەی جوێن و تانەو تەشەرێکی زۆر کراوە بۆ یارانی پێغەمبەر ، لەبەر ئەمە کتێبەکەی بۆ ئەنێرێتەوە، خیانەت لە عیلم و ئایینەکەی ناکات و، بە بێ ترس و ڕاڕا بە توندی و تیژی وەڵامەکەی –وەك ئەیبینی –دەنووسێتەوە.**

ڕۆژانەمان و، شێوازی پەروەردەیی مان بۆ دیاری دەکا، ئەوەمان پێ ڕادەگەیەنێ کەئەبێ بەهەموو هەنس و کەوتێکمان ڕەنگدانەوەی ناوەرۆکەکەی بێ، ئامۆژگاری و ڕێ نموویەکی هەتا هەتایی یەوە لێی لانادرێ ، چوونە دەرەوە لە مەفهوومەکەی ناچێتە ناو فەرهەنگی ڕەوشت و ئەخلاقیمانەوە.

کەواتە بەنەغمەی سردووی ئەم ئایەتە قورئانی یەوە دەتوانم بڵێم ڕستەی من هاتە کۆتایی و، دەرگای ووتوو وێژی پێ داخرا.

بەڵام بۆ جیاکردنەوەی وتەی ڕاست و ڕەوان لە وتەی چەوت و ناڕاست و مەداو مەودای هەڵسەنگاندنیان و سنوور بۆ دانای هەریەکەیان .. دواندنتان بە ناچار ئەزانم کەبە نووسین کەکەمێك ڕۆژگارتان لەگەڵدا بەرمەسەر.

ماوەیەك لەمەو پێش بە میرزا (ربیع) دا [1] نامەیەکم پێشکەش کردن ، کەبەشکو لەڕێگای (فخرالعلما) وەبە خزمەت (والا) تان بگات و، [2] تیایدا. لەگەڵ بەرێزتانا دوام و سەرم ئێشاندن، بەڵام جێی داخە میوانی وەرزی (هاوین ) هات و ڕۆیشت، دوابەدوای ئەو بەزمی کەشی ئازیز ( پاییز ) تەختی زەویی زێڕین فەرش کردو ئارایشی داو ڕازاندی یەوە[1]، ئنجا ئەمیش ماڵ ئاوایی کردو ڕۆیی ، زستانیش بەهەموو ئۆف و تۆفی سەخت و دیشواری یەوە دەرگای پێ گرتووین و ئێستا میوانە، لەوناوجەرگەو ناخی ئەم ئۆف و تۆفەیدا چاوەڕێی شنەوشنۆی ئەسیمی وەڵامی بەهاری پڕ بەهای (والا) تا ن بووم نەهات و نەهات و نەهات .

جا ئەگەر نامەکەم گەیشتووەو بەدەس ئەنقەس وەڵامەکەیتان خستۆتە پشت گوێ؟ ئەوە لەم کاتەدا دوو وێنەیەو سێ یەمیان نی یە.

یەکەم: گوایە وەڵامی نەزان چارەی بێ دەنگی و خامۆشی یە، جا ئەگەر -خوانە خواستە- ئەوەتان نیازە ئەو-لەم کاتەدا- پەنا ئەگرم بە خوا، کەمن نەزان و دەستەو سان بم!! با پرسیارم ئاڕاستە بکرێ، تامنیش -بۆنەهێشتنی گومان و- بەنیازی گەیشتن بە (الحق و الیقین) بە وەڵامی پڕ لە بە ڵگەی ڕوون و ئاشکرا بێمە مەیدانەوە.

---

[1] ئەم میرزا ڕەبیعە بە گومانم ئەوکەسەیە کەفەرهاد میرزا کتێبەکەی (سبط) ی پیادا ناردووە بۆ مەولەوی.

[2] وشەی (والا) یا (نواب) .. نازناوی والی یەکانی کوردستانی ئەردەڵانە ، لێرەدا مەبەست پێی فەرهاد میرزایە.

[1] گەڵای زەردی خەزانی پاییز ی چواندوە بە زێڕەوە و زەویش بە ئافرەتەوە.

دووەم: ( سکوت ) و بێ دەنگیتان کردە پیشەی خۆتان لەکاتێکدا کەکاتی گۆڕینەوەی بیرو ڕابوو-[٢].
ئەمەیان بۆ من دەبێ بە مایەی بەختەوەری و پیرۆزی و سەرکەوتن، دڵ شنەی پێ ئەکاو خەندە لەسەر لێوانی دەڕوێ، بەمانای ئەوە نووسینەکەم بۆنی ئیلزام و خۆبەستنەوە دانتان ئەدا بە دەماخی کەسانی خاوەن زانست و خاوەن هۆش و گۆشدا.
بەلام بەنەگەیشتنی نامەکەم بەدەستتان مافی گلەییم نی یە.
جا لەم کاتەدا خۆم بەناچار ئەزانم کەمەفهومی ئەو نامەیەم سەر لە نوێ بکەم بە نەقش و نیگاری ئەم نامەیەم و، بی ئاڵێنم بە دنیای زێیای دەربڕینەکەتدا کە فەرمووتانە : کتێبی ناوبراو دانراوی یەکێکە لەکەڵە زاناکانی پەیڕەوانی شافیعی... منیش بە وردی و بە قووڵی چوومە ناخی کتێبەکەوە ، لەسەرەتایەوە تا کۆتای بە تێگەیشتنەوە خوێندرایەوە، لە ئە نجامدا دیم ناوەرۆکەکەی مەڵحەمێك بوو، توخمەکانی لە بەشێکیدا پێك هاتبوو لە گەورەیی و پلەو پایەی بەرزێتی و خۆشە ویستێتی عەلی و نەوەکانی و پەیڕەوانیان، وە بەشەکەی تری پێك هاتبوو لە کۆمەڵێك لە تانەو توانج و تەشەر کەڕاستەو خۆ ئاڕاستەی یارانی پێغەمبەر کرابوو، ئەمەش دیارە بەئارەزووی هێنانە خوارەوەی پلەو پایەی بەرزی یان شێلرابوو، ئەم مەڵحەمە دیارە دەرمانێك نەبوو بۆ لەشی پاکی ئایینی بەرزی پیرۆزی ئیسلام بشێت، بەڵکو بێ گومانم زیانی پێ دەگەیینێ و ئیفلیجی ئەکات.
دەستەی سوننەت وکۆمەڵ ( جماعە ) کەبە ( الفرقە الناجیە ) ناسراوون، هەموویان لە ڕەفتارو سلووك و خویاندا میانە ڕەوو مام ناوەندین، ئەم دەستەناوازەیە، نەبەرامبەر بە بە کۆی پێغەمبەران و ، نەبەرامبەر بە یاران و ڕای جیاوازیان نی یەو، باوەڕیان بە تاك و کۆیان هەیەو، لە ڕووی قین و ڕقەوە لێکیان جیا ناکەنەوە. هەرچۆنێ بێ پێغەمبەرەکان لە هەموو کەیانی تر جگەلەخۆیان بە موتڵەقی بەگەورەتر دائەنێن، وەهیچ تاکێکیان لە پێغەمبەران بە گەورەتر نازانن .
یارانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) هەموویان خاوەن ئیجتیهادو دادا پەروەرن، کامیان ئیجتیهادیان دابێتی لە نیشانەو پێکابێتی، بێ گومان پاداشەکەی لە دوو تا دە ئەجر کەمتر نی یە و مسۆگەرە، وەبپێچەوانەشەوە، کامیان هەڵە بن و ئەیان دابێ لە نیشانە بەیەك ئەجر پاداش ئەدرێتەوە، بە بێ بە ڵگەی ئاشکرای ڕووناك وەك ڕۆژی نیوەڕۆ لە خۆیانەوە حوکمی کوفری کەس

[٢] زانایانی (اصول الفقە) ئەڵێن: (السکوت فی معرض البیان یدل علی الرضا) واتە قسەکانی منت بە دڵ بووەو لێیان لاڵووت نەبوویت و، بەرامبەریان لاریت نەبووە.

نادەن و، نەفرین لەهیچ کەسێکی تایبەت ناکەن، لەبەر ئەوەی ئە نجامی کۆتایی نهێنی یەویە بەڵگەی بێ هێزو داتاشراوو خەیاڵاوی کوفر لای ئەوان هەرگیز گیر نابێ و ناچەسپێ.

گریمان ئێمە بەبەڵگەی بێ گەردی وەك ڕۆژ ئاشکرا حوکمی کوفرمان دا بەسەر یەکێك لەیاراندا، ئەوە ئەوپەڕی ئەوەیە کەئەوکەسە بچێتە ڕیزی شەیتانەوە، ئایا خوای گەورە نەفرینی شەیتانی فەرزکردووە لەسەرمان ؟ وەئایا کردوویە بەبەشێ لە کرداری ڕۆژانەمان ؟ وەئایا خوای گەورە فەرموویەتی ( العنوا الشیطان ) ؟

خوای گەورە دڵ و زبان و مێشکی داوێنەتی کەلەیادی خاوێنی ئەوەدا بەکاری بێنین، چ ئە نجامێکی سوود بەخشی هەیە کەئەندامانی نهێنی و ئاشکرای لەشمان بەنەفرینی شەیتان خەریك بکەین و بیکەین بەکاری پێویستی ڕۆژانەمان ؟ بەڵکو شەیتان خوا خوایەو لەوە ئەگەڕێ کەباوەڕداران بەشتانی پڕو پوچی ئاواوە- با نەفرینی خۆشی بێ –خەریك بکا.

یەکێك ڕەگ و ڕیشەی باوەڕی لەناخی زەویی دڵیدا بە قووڵی داچووبێ، لە دواییدا بەرامبەربەو کەسە بە پەیدا بوونی گومان و بە بەڵگەی خەیاڵاوی ، وەیا بە درۆی ڕووت ئەو ڕەگە بن کەن ناکاو، نەبەعەقڵ و نەبە شەرعنەفرینی ڕەوا نی یە.

ئنجا بۆم هەیە بڵێم، ئەگەر جەنابی (والا) تان کتێبەکەتان –بەناوی دیاری یەوە-بۆ ئەوە ناردووە کە گوایە من لە گەورەیی عەلی و لە سیفەتە بەرزەکانی عەلی بێ ئاگام وەبەشایستەی خەلافەتی نازانم، وەئەتانەوێ بەو کتێبە سەرنجم ڕابکێشن و دانیان پیا بنێم، ( حاشا وکلا ) ئێمە لەو تۆمەتەوە دوورین، ئێمە خۆمان بە دەرکەوانی عەلی و ئەوەی عەلی ئەزانین، پلەی گەورەیی عەلی و ڕەوشت و خووە بەرزەکانی کەلەو کتێبەدا ئاماژە (ئیشارە) یان بۆ کراوە ، من بەچەندین زیادەوە لە شاکتێبەکانی سوننەتدا دیومن و هەن جێی گومان نین، سوپاس بۆخوا من دانیان پیا دەنێم و، لە دەریای خۆشەویستی عەلی و ئەوەکانی و کۆی یارانی بە پێوانەو ئەندازەی توانای خۆم هەڵێنجاوە، حەزرەتی ئەمیر بە شێری خواو بەئەبەزو بەموجتەهید بەخاوەن دەسەڵاتی ئەزانم ، ئەك بە ڕێوی ترسنۆك و بەئەزان و دەستەو سان و سەرگەردان و بەش خوراو.

بەبەڵگەی بەهێزو پتەو بە شایستەی جێ نشینی و بە پێشەوای موسڵمانانی ئەزانم، بەڵام لە پلەی چوارەمدا!

یارانی پێغەمبەر هیچ کامیان – دوای لە دنیا دەرچوونی حەزرەت-بە بێ ئاگاداری ئەو ئەچووتە سەر کورسی خەلافەت و فەرمان ڕەوایی ، عەلی خۆی لە خۆیدا زاناو خاوەن ئیجتیهادو بەسەر هەموو دەقەکاندا ئاگادارو

شارەزا بووە، وەلە هەمانکاتدا بە دەسەڵات و ، بە هێزو دلێرو سەربەست و چاو نەترساو بووە ، بەم حاڵەشەوە و بەم سیفاتە بەرزانەیەوە هۆزێکی گەورەی وەك قورەیش پشتیوانی بوون.
زاتێکی هەڵکەوتووی وەها دیارە نەلەکەس ترساوە نەتەقیەشی [1] بە کارهێناوە، گەورەیی عەلی لەلایەن کۆی یارانی یەوە گومانی تیا نی یەو جێی خۆی گرتووە، زانایانی سوننەت خوایان لێ ڕازی لە نووسراوەکانیاندا دێر بە دێر تۆماریان کردوون خستوویانەتە ڕوو.
جیاوازیەك کەبەگوێرەی (أختلاف امتی رحمە ) لە ناویاندا ڕووی دابێ، ئەوە تەنیا لە ڕووی ئیجتیهادەوە بووە، نەك لە ڕووی دوشمنایەتی یەوە.
لە نێوان ( عداوە ) و ( مخالفە ) دا ( عموم ) و ( خصوص ) هەیە نەك یەکسانی، هەر وەك پێچەوانە کردنەوەی مەفهوومی ( القضیة الکلیة ) هەمان مانا دەگەیەنێ.
گریمان ئیجتیهاد کردن لەیەکێك لە بابەتە پێچەوانەکاندا لە کێشەی کارو باری فەرعیدا گەیشتە ڕادەو پلەی جەنگ و بەیەکدا هەڵگژان، بەم حاڵەشەوە جگەلە پاداشتی چاکە بەولاوە پاداشتی سزایان نی یە، هیچ لایەنێکیان لە جوغزی برایەتیی ئایینی ل ڕووی عەقیدەو باوەڕەوە بە دڵ ناچنە دەرەوە.
ئەو پیا هەڵدان و ڕێزگرتن و دەست بە سنگەوە گرتنانەی عەلی، چ بەرامبەر بە یاران و چ بەرامبەر بە جێ نشینەکانی پێش خۆی –بە پێی بەڵگەکانی ڕابردوو-هیچیان لە ڕووی تەقیەوە نەبووە، شێری خواو خاوەن دەسەڵات و بەتوانای وەك عەلی، ئایا تەقیەو ئەوەیان وتووە؟ پەنا ئەگرم بە خوا !!
گریمان عەلی لەسەردەمی ژیانی جێ نشینەکانی پێش خۆیدا لە ژێر پەردەی ترسدا تەقیەی بەکار نەهێنا ، ئەی دوای مردنی ئەوان و نەمان ی ئەو ترسە، ئایا تەقیە ڕەوایە؟
کێ لە مردوو نەترسێ و تەقیەی لێ ئەکا؟

---

[1] تەقیە: خۆپاراستن و دان بە خۆدا گرتن، لە ڕێبازی ئەوانەدا کە بروایان پێ یە بە شێکە لە واجب و فەرزە لەسەریان بەکاری بێنن، واتە کاتێ لە لایەن کاربەدەستانی میری یەوە، بەناڕەوا مەترسی یەك ڕووبدات و لە کردنی دا تووشی زیانی گیانی ومالّی بن، لەم کاتەدا بۆیان هەیەو فەرزە لەسەریان بەکاری دژایەتی نەجوڵێنەوە، بە زبان نەك بە دڵ ڕەزامەندی پیشان بدەن، و پێشی گوناهبار نابن، بەلام لای سوننە تەقیە بەو پلەیەو هەموو کاتێك مەشروع نی یە.

بەچەندین جار عەلی دوای مردنی جێ نشینەکان ویاران بە نهێنیّ و ئاشکرا، بە سوپاس و ستایش و پیاهەڵدانی چاکەیان زبانی ڕەوان بێژیی لەمەدح و وەصفیاندا نەخستە گەڕو هەمیشە بەچاکەوە ناوی دەهێنان و ڕەحمەتی بۆ دەناردن.

دەربارەی ئەو یاخی بوونەی کەهەندێ یاران پێی هەستان و بەرانبەر عەلی جەنگان و گەیشە پلەی برا کوژی ، ئەوە لەڕووی ئیجتیهادەوە بوو، زۆر جار عەلی ئەیفەرموو: ( اخواننا بغو علینا ) هەمیشە لە جوێن پێدانیان و نەفرین کردنیان و لە ئاڕاستەکردنی قسەی سوك و ناشیرین و نارەوا خود گیری دەکر و لێی ئەسلەمیەوە.

جەنگێك لە نێوان دایکی موسڵمانان و ئیمامدا ڕوویدا، ئەو جەنگە بەمەبەستی بچڕینی حەلافەت ئەوو، هەر واتە واتەیەك پێچەوانەی ئەم ڕایەبێ، بێ گوما درۆیەو لە بوختان بەولاوە شتێکی تر نی یە، کێشەکە پەرەی سەندو فراوان بوو، وەهەر یەیکەیان بە ئیجتیهاد ڕێگایەکی جیاوازیان گرتە بەر، ئەمان دەیان ویست دەست بەجێ تۆڵە لە قاتیلەکانی عوسمان بسەنرێت ودوانەخرێت، ئیمامیش لاری لەوە نەبوو، بەلاّم لەبەر ئەوە ئارامی و ئاسایش هێشتا ڕەگی دانەکوتابوو، دەیویست مەسەلەی تۆڵەو لێ پرسینەوەیان دوا بخرێت بۆ کاتی ئاسایی و نەمانی ئاژاوە، وەلەلایەکی کەوە ئیمام لەوە ئەترسا کەئەم تۆڵە ساندنەوەیە لەم کاتە ناسکەدا دوژمنانی ئیسلام بیکەن بە دەست پێچك و بیانوو، لە پڕ پەلامالاریان بدەن، وەلەلایەکە کەشەوەبەو گەرمەو بەو پەلە پەلە چەوتی لە ڕاستی جودا نەئەکرایەوە، چونکە قاتیلەکان زۆر بوون، و مەترسی یاخی ببونان لێ ئەکرا، جگە لەمانەش هەردوولا هەلیان بۆ هەڵنەئەکەوت پێکەوە دانیشن و لەمەسەکە بکۆڵنەوە.[1]

لەم ئیجتیهادەدا حەزرەتی ئەمیر خاوەنی پاداشی دوو ئەجر تا دە ئەجرو، ئەوانی تر بەیەك ئەجر پاداش ئەدرێنەوە.

کەواتە ئیجتیهاد قەڵغانێکە، هەردوولا تیری تانەی دوژمن ئەپارێزێ و کوژەر و کوژراویان لەبەهەشتدان و بە تاوانبار ناناسرێن.

---

[1] لەم یاخی بونەدا هەر کەم و کووڕی یەك وخوێن ڕشتنێك ڕووی دابێ ، بێ گومان کۆمەڵی یاخی بووەکان لێی بەرپرسیارن، چونکە لە پڕ ئاڵای یاخێتیان هەڵکردو لەئەنجام نەکۆڵینەوە، تا تووشی ئەو هەمووزیانی گیانی و ماڵی یەبوون، ئیجتیهاد دەبێ بەبەڵگەی پتەو بێ و لەناوجەرگەی دەقەوە هەڵقوڵابێ.. وەرگێڕ.

ئەگەر مەبەستی (والا) تان بەو فەرموودەیەتان (خەلافەتی عەلی لەبەر سیفاتە بەرزەکانی پێویست بوو لە پلەی یەکەمدا بێ ) وەك لەدەقی کتێبەکەدا ناوبە ناو بەرستەی (هذا نص صریح فی امامتة ) دەیگەیەنێ.
پێشەکی ئەم داوایەتان بۆ ناچێتەسەر، بۆ؟ چونکە ئیمامەت لای برایانی شیعە بەشێکە لە (اصول) ، وەمەسائیلی ئەصولیش بەرای هەموو لایەك -بەبێ جیاوازی- بەڵگەی بێ گەردو دوور لەگومانی ئەوێ، بەڵگەی بەگومان و تاریك بۆ (فروع)ە نەك (اصول) چونکە (الفقه من الباب الظنون).
وەئەگەر مەبەستتان چەسپاندنی مافی جێ نشێنێتی یە بۆی و لە پلەی چوارەمدا (کەئەمەشتان مەبەست نی یە-گۆڕەر) ، ئەوە ئێمەش بەم رایە پیرۆزبایی تان لێ ئەکەین و (فنعم الوفاق) مان لەسەرە،
ئەوا کردمان وشەی (مولی) و (ولی) لە نموونەی فەرمودەی وەك ( من کنت مولاه فعلی مولاه) وە وەك (وانما ولیکم الله ورسوله والذین امنوا) ... مائدة ٥٥).
(متواتر) مو گومانی تێدا نی یە ، بەڵام بائەوەش بزانین خاوەنی ئەو کتێبە کە تۆ پشتت پێ بە ستووە، نەیتوانیوە مانای (ولی) و(مولی) -لەم شوێنەدا- چی یەو چ مانایەك ئەگەیەنی؟. بەو مەبەستەی ئەو ئەیەوێ و وویستویەتی، نە ڕووی زبان و یاساوە، وەنەلەڕووی عورف و شەرعەوە (متواتر) نی یە. نەك بڵێم هەرگیز بەمانای (ئیمامی یەکەم) نەهاتووە، بەڵکو بەهیچ جۆرێك بەمەعنای (ئیمام) هەرنەهاتووە.
با لەم بوارەدا واز لەم شێوازە بێنینو بە شێوەیەکە تر بچینە قوڵایی و ناخی مەسەلەکەومو لاپەڕەیەکی تازە هەڵدەینەوە.
گریمان ڕەوشت و خووە بەرزەکانی عەلی لەڕووی ڕاستیو ڕووناکیی و شۆڕەتیانەوە گەیشتونەتە پلەو پایەی موعجیزەی سەرومری بونەومر (بەهەزاران درووودو سڵاوی لەسەر بێ) لە کاتەدا ئەتوانم و بۆم هەیە بڵێم : ئایا ئەو موعجیزانە بەتەنیا ئەبن بە بەڵگەی چەسپاندن و جێگیر بوونی پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەرو دوا زنجیرەی (خاتمیه) ی پێغەمبەرایەتی؟ دیارو ئاشکرایە بە بێ دەقی تەواوکەری (ولکن رسول الله وخاتم النبیین) ە. ئەئیسپاتی پێغەمبەرێتیی ئەکات و نە (خاتمیه) ی ئەچەسپێنێت.
کەواتە ڕەوشت و خووی بەرزی عەلی وەك ئەبێ بەبەڵگەی چەسپاندنی گەورەیی دیارە نابێ بەبەڵگەی جێگیرکردنی خەلافەتی و، وەلەپلەی یەکەمدا، ئەو چەسپاندنە بەڵگەیەکی وەك

(على هو المعصوم وافضل البشر بعد النبيين) مو (وخليفتى اولا بلا فاصيلة بعدى) ى ئەوێت، بڕوانە ئەندازەی جیاوازی ڕێگا لە کوێوەیەو بۆ کوێ ئەچێ؟.
مەسەلەی کێشەی دروست بوون و نەبوونی پێش خستنی (فاضل) لەسەر (افضل) زۆر دوورە لەو پەڕی دیشواریدایە، چونکە مەسەلەی گەورەیی کەسێك و گەورەترو نزم تر بوونی لەکەسێکی تر، بەندە بە ئەندازەی پلەی نزیکی و دووری یان لە خواوە وەو، لە زۆریی و کەمیی چاکەو خرا پەیان لە ڕۆژی دواییدا، زۆریی خێرو (ثواب) ی یەکێکیان لەوی تریان-وەبە پێچەوانەکەشەوە- لای ئێمە نهێنی یەو هەر خوا خۆی بەتەنیا ئاگادارەلە کۆتایی کاریان، -هەروەك ئەمە لێرەدا مەبەستە- ئاشکرایە جگەلەخوا – وەك وترا- کەسی تر نایزانێ، بگرە (کراماالکاتبین) یش ناکەنە ئەو ڕادەیە کەچاکەی ئەم چەندەو، چاکەی ئەوی تر تا چ ئەندازەیەکە؟
کێئەیەوێ بەڵگەی چەسپاندنی خەلافەتی ئەمیر بچەسپێنێ لە پلەی یەکەمداو گەورەتربوونی بەموتڵەقی، با ئەوکەسە بەرامبەرمان بوەستێت، تائێمەش بە پێی تواناوامان و بۆ ڕوون کردنەوەی حەق لە ناحەق لەتەکیا دەکەوینە گفتوگۆو دواندنیەوە.
جگە لەم واتانای سەرەوە زاناکانمان –خوا پاداشتی تێکۆشان وچاکەیان بداتەوە-نەیان هێشت کار لەکار بترازێت، کە دەرچوەکان(الخوارجیون) تیری تانەو نەفرین و توانجیان ئاڕاستەی ئەمیر کردو، حوکمی کوفریان ئەدا بەسەریا، وەلەلایەکی کەوە کەزانی یان برایانی شیعە جنێوو قسەی ناشیرین و ناشایستە یان ئەگرتە جێ نشینەکانی پێش عەلی و توانجیان ئەدا لە دایکی موسڵمانان و لەیارانی تر، ئەو زانایانەمان بەرامبەربەم نارەوایەی ئەوان هاتن، هەموو ئەو ئایەت و فەرموودانەی کە پەیوەند بوون بە چاکە و گەورەیی و ڕەوشت و خووی بەرزی یانەوە بە شێوەی زانستی یانەوە بەو پەڕی جوانکاری یەوە نوسینیان و (تەدوین) یان تیا کرد، بۆئەوەی موسڵمان بەرامبەر بە هیچیان بڕواو عەقیدەیان نەگۆڕێ و بەچاوی یەکسانی یەوە سەیریان بکەن، هەموویاران- بەبێ جیاوازی- پاکەو بێ گەردن و لە هەموو تانەو تۆمەت ونەفرین دوورن، نەك مەبەستیان ئەوە بووبێ گوایە هەندێکیان لەهەندێ تریان گەورەترو چاك....ترن.مەبەستیان ئەوەبوو کەبەر پەرچی ئەوانە بدەنەوە کەعەلی بەلادەرو بە گومڕا ئەزانن، وەیا ئەوانەی کە جوێن ئەدەن بەجێ نشینەکانی ترو بە هەندێ یارانی تر.
دەستەی بنەماڵەی سوننەت لایان وایە قین و ڕق وئیمان لە دڵی هیچ موسڵمانێکدا کۆنابنەوەو دەستە مل نابن، یارانی پێغەمبەر هەموویان مژدەی بەهەشتیان دراوەتێ و بەخەلاتی ڕەزامەندێتی خوا بەهرە وەرو شکۆمەند بوون.

**برایانی شیعه-خوا ئینسافیان بداتێ- ئەو ڕەوشت و خووە بەرزانەی کوزانایانی ئێمە بۆ عەلی یان چەسپاندبوو ، ئەمان هاتن کردیان بەبەڵگەی (معصومیە) و بوونی بەخەلیفەی یەکەم و بەموتڵەقی گەورەیی. لە ئێمەوە فێر بوون و لێیان کڕین و پێیان فرۆشتینەوە، ئەگینا گەورەیی عەلی و سالاریی عەلی و هەڵکەوتوویی عەلی لەکێ گوم و شاراوەیە؟.**

**خوای گەورە بەکەم هۆشان ئەفەرموێ (تلك الرسل فضلنا بعضهم على بعض منهم...) نافەرموێ هەمان پێغەمبەری تایبەتمان بەسەر هەمان پێغەمبەری تایبەتدا گەورەتر کرد، بەڵکو بەشێوەی نهێنی بووی چووە، واتە بڕوا بە (نبوە) مەرجە. نەك بڕواکردن بە گەورە بوونی یەکێکیان بەسەر ئەوانی تریاندا، کەواتە زانین بە پلەو پایەی گەورەیی وبچوکی پێغەمبەران و یاران بەشێك نی یە لە پێویستی یەکانی عەقیدەو باوەڕ.**

**من لەو باوەڕەدانیم کە دانەری ئەو کتێبە یەکێك بێ لەزانایانی شیعە، چونکە ئەموجتەهیدەکانمان و نە پەیڕەوەکانیان هیچیان بە جوێن و تانەو توانج یادی یارانیان نەکردووە.گریمان زانایەکی سەر بەشافیعی ئەو کتێبەی دانابێ ، بەڵام بەبێ گومان ئەو دانەرە باش و خراپ و حەڵاڵ و درۆو بوختانی تێکەڵ کردووە و لێکی جیا نەکردونەتەوە، لە کتێبەکەیدا پەنای بردۆتە بەر قسەی لاوازو پووچەڵ، کەزۆر لەیەقینەوە دوورە، داوای هیچ خاوەن داوایەك ناچەسپێنێ.**

**ئێوەی بەڕێز-خوا بتانپارێزێ-سەرگەرمی دادو دادپەروەرین هەر چینێك بە پێی شایستەی خۆی و، لەسنوری تایبەتی خۆیاندا ئاوڕیان لێ بدەرەوە و جیاوازی لە نێوان مێشولەو عەنقایەکدا مەخە، دوابەدوای ئەوە لە ئێمەی دۆعا گۆوە سوپاستان ودۆعای سەرکەوتنتان پێویستی سەرشانمانە.**

**ئێستا بەڕێزتان بەناوی فەرمان دانتان بە چاکەو قەدەغە کردن لەخراپەو لە کارانی ناڕەوا جل وبەرگی ئیجتیهادتان لەبەر کردووە، بەوپەڕی لێبووردن و بەگەرمی خەڵك ئەکەن بۆ ئەوەی بیانخەیتە سەر ڕێگەی (تشیع) ئەمەتان بەلای منەوە تەواو نی یە و ناڕەوا وەرنەگیرێ[1]**

**پێویستە لەسەر ئێمەی زانایان ڕای خۆمان بە ئاشکرا دەربڕین و بۆ ڕوون کردنەوەو جوێ کردنەوەی کاری ڕەوا خۆمان بڕەنجێنین و لەکەس نەترسین و لەبەرەم هەموو کۆسپێك و هەموو کەسێکدا پێویستە خۆمان ڕابگرین.**

---

(١) زانای ئایینی ئەبێ وابێ و ئاوەها بێ پەردە پەنجە بکا بە قوڕگی شێراو لە هیچ سڵ نەکات و هەمیشە ئەبێ (لاگاعە لمخلوق فی معصیە الخالق) ی لەبەر ڕەچاوێی و کۆڵنەدان.

له كۆتاییدا تكایه بەرامبەر بەم نامەیەم ئاوێنەی دڵت گەرد نەگرێت و، بەوەڵام دانەوەت شادمانم بكەیت، تا منیش لەلایەن خۆمەوە بە (سَلمنا ) وەیا بە(مَنعنا ) بێمەوە مەیدان. چونكە بووم بە مایەی سەرێشەتان بەم بەیتەی خواجە حافظی شیرازی نامەكەم كۆتا ئەكەم:

غیر ازین نکته که ( حافظ ) از تو ناخوشنود است

در سرا پای وجودت هنری نیست کی نیست

زانای ئایینی ئەبێ وابێ و ئاوەها بێ پەردە پەنجە بكا بەقورگی شێراو لەهیچ سڵ نەكات و هەمیشە ئەبێ ( لا طاعة لمخلوق في معصیة الخالق ) ی لەبەر ڕەچاوبێ و كۆڵنەدان.

**مەعدووم**

**مەولەوی لەئەنجامی کێشەیەکی مەزهەبی و ئایینی دا چەند جارێك نامە ئەنێرێ بۆ فەرهاد میرزا و لەگەڵیدا لە ڕێگای نامەوە ئەکەوێتە وتو وێژەوە،وەئەم نامەیەش هەر لەو ڕووەوە لەڕێگای مەلا محەمەد صالحی ( فخر العلما ) وە ئەنێرێ بۆ شێخ یوسفی ( مدرس ) [1]**

---

(١) بۆ ئەوەی لە نامەکەدا بەتەواوی بگەین پێویستیمان بەم ڕوونکردنەوەی خوارەوەوە هەیە:
فەرهاد میرزا هەرچەند فەرمانڕەوایەکی بەسوودو داد پەروەرو بەبەزیی بووە، بەڵام لەپەنای فەرمانڕەوایی یەکەیدا وەکو زوتر باس کرا وییستویەتی لەڕێگای مەلاو دۆستانی یەوە کوردەکانی (سنە) و دەورو بەری بکا بەشیعەو. ڕێبازی جەعفەریان بەسەرا بسەپێنێ ، جا لەماوەی فەرمانی ڕەوایی یەکەیدا بۆ چەسپانی کارەکەی کۆمەڵێکی زۆری شیعەی جەعفەری لەهەرێمە فارسەکانەوە دێنێ بۆ شاری (سنە) و تیایدانیشتەجێ یان ئەکات، لەئەنجامی قسە بەزۆران دان و ئاڵوگۆڕی بیرو ڕادا جەنگیکی خوێناوی لەنێوانیاندا پەیدا ئەبێ –جگەلەکوشتنی چەند کەس لەهەردوولا – موجتەهیدی جەعفەری یەکان (شێخ محمد تقی) لەلایەن کوردەکانەوە–بەحەق یات بەناحەق– ئەکوژرێت وهەراکە گەرمتر ئەبێ‌ن لەلایەن میری یەوە بۆ بەدی هێنانی هێمنی و ئاسایش، چەند هەنگاوێك نرا. یەکێك لەوانە دوورخستنەوەی (مدرس) ی مزگەوتی (دار الاحسان) شێخ (عبدالقادر) ی موهاجیری بوو.ماڵ ومناڵەکەی لە سنە بەبێ مانگانە بۆ ماوەیەك مانەوەو خۆیان ڕەوانە کرد بۆ کوردستانی عێراق، کەلەو سەردەمەدا سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بوو، لە دواییدا بە تکای مەولەوی–وەك لە نامەکەیدا هاتووە– فەرهاد میرزا مانگانەکەی گێڕایەوە بۆ خێزانەکەی.
دوا بەدوای دوورخستنەوەی موهاجیر، شێخ یوسفی ئامۆزای لەلایەن میری یەوە بەڕەسمی کرا بە (مدرس) ی مزگەوتی (دارالاحسان) ، جگەلە دانانی بە وەزیفەی (تدریس) کراش بە سەرپەرشتی کەری ئەو گوندانەی کەسەردەمی خۆی (امان الله خان) ی گەورە کردبوونی بە وەقفی مزگەوتی‌کە.
ئەم شێخ یوسف ناو کەلەنامەکەدا بە (مدرس) ی ڕووت ناوئەبرێت، وەك لەنامەکەی خودی مەولەویدا ڕەچاوی ئەکرێت مەلای دەربارو خۆفرۆش و دووڕوو دنیا پەرست بووە. بۆخۆنزیك کردنەوەی لەبارەگاوە بە ڕاست و بە چەوت بەرگری و پشتگیریی فەرهاد میرزای کردووە، ئایا لەخۆیەوە وە یا بە هاندانی فەرهاد میرزا؟ چەند جارێك نامەی پڕو پوچ و ناشایستە ئەنێرێ بۆمەولەوی ، وەلەکێشەی ئایینی و مەزهەبییدا لایەنی فەرهاد میرزا و هێرشی ناڕەوا ئەباتە سەر مەولەوی. بەم بۆنەیەوە مەولەوی بەم نامەیەی، لەدژی ئەوەستێ و زانستانە وەڵامی ئەداتەوە. بەڵام نازانم بۆ ڕاستەو خۆ نامەکە نانێرێ بۆ (مدرس) و لە ڕێگای (فخرالعلما) وە ئەیدوێنێ؟
لەنامەکەدا هاتووە مەولەوی لە ڕێگای (فخرالعلما) وە نامەیەك ئەنێرێ بۆ فەرهاد میرزاو، ئەیەوێ (لەبەر هەر هۆیەك بووبێ) (مدرس) بەو نامەیەی نەزانێ، بەڵام لە دواییدا (فخر) ئەم نهێنییەی ئاشکرا ئەکاو ئەیدرکێنێ.

## دەقی نامەکەی مەولەوی:

لەمنی یەك كەوتووی چەرخی ڕۆژگارەوە مەن مەن، نەء،بەڵكو خەرمان خەرمان، بۆ كۆگای ڕەوشت و خووی بەرزی ڕازاوە، (فخر) ی ڕۆژگار، عەرزی سڵاوو دۆعاو نزای خێرمان بۆ سەعادەت و بەختەوەریی سەرەنجامی دوابیتان پێشكەش بێ.

(وبعد) موجتەهیدانی ئیمەی بنەماڵەی سوننەت لەبابەتەكانی زانستیی (فقه) دا لەشنەی هەناسەی پاكی بەفەڕی پێغەمبەرایەتیی یەوە (هەزاران درودو هەزاران سڵاو لەسەر چاوەكەی بێ) دوو فەرموودەیان خستئتە بەرچاومان، هەردوو فەرموودەكە بۆ هەموو موسڵمانان بە گشتی و بۆ زانایان و كاربەدەستانی میری بە تایبەتی بوون بەسەرچاوەی ترس و بیم.

فەرموودەی یەكەم:

(اذا ظهرت الفتن ، وسب اصحابی، فلیظهر العالم علمه ، فمن لم یفعل ذلك فعلیه لعنة الله والملائكة والناس اجمعین، لایقبل الله منه صرفا ولا عدلا).

فەرموودەی دووەم:

(من رای منكم منكرا فلیغیره بیده ، فان لم یستطیع فبلسانه ، وان لم یستطیع فبقلبه، وذلك اضعف الایمان) صدق رسول الله صلی الله علیه وسلم

فەرموودەی یەكەم ڕوون و ئاشكرایە، بەڵام دووەمیان پێویستی بەهەندێ ڕاڤەو لێكۆڵینەوەهەیە. زانایانی هەڵكەوتوو لە توێژینەوەیدا چی یان فەرمووە منیش بەو مضمونە وە دەیخەمە بەرچاو.

(رای) :لە (ڕوئیەتی) بەمانا زانینە ، نەك (ڕوئیەتی) حاسەی چاو ، واتە بزانێ بە گوناهەكەو هەستی پێ بكات ، مەرج نی یە بەچاو بی بینێ.

(منكم) : مەبەست پێی: هەموو تاك و كۆی موسڵمانانە (چ نێر، چ مێ- وەرگێڕ) لەهەموو سەردەمێكدا.

(منكرا): كاری ناڕەوا، حەرام...

(فلیغیره) : با بیگۆڕێ، ئەمرەكە بۆ ووجوویە، ئەم گۆڕینەش دەبێ لە ڕووی شەرعەوە بێ ، نەك بە گۆترە وەیا بە عەقڵی ڕووت.

(بیده) بەدەست و بەهێز. ئەگەر نەیتوانی بەدەست كاری تێ بكا- وەكو ئەوە لە زیانی ماڵی یا بەدەنی بترسێت.. بەڵام هەرەشەو گوڕەشەی ڕووت نابێ بە بەڵگەی خۆڵێ گێل كردنی، وەك لەم فەرموودەیەوە دەرئەكەوێ كە تورمزی ئەیگێڕێتەوەو ئەفەرموێ:

(الا لا یمنعن رجلاً هیبة الناس ان یقول الحق اذا علمه)

( فان لم يستطيع فبلسانه ): به زبان و به وتن ئەگەر نەیتوانی کاری تێ بکات، ئەوە بە تورەیی یا بەنەرمی ڕووی تێبکات، کامیان کاریگەرو گونجاوترە، ئەوەیان بەکاربێنێ،

( فان لم يستطع فبقلبه ): ئەگەر توانای دەمکوت نەبوو ئەوە پێویستە بەدڵ و بەنهێنی ڕقی لێی بێ وئەیەوێ

وەکو ئەوە ستەمکارەکە تانە بدا لە ئیمامەکان و پیشەوایانی تر.

( وذلك اضعف الايمان ): ئەوە لاوازترین حاڵەت و دوا پلەی نزمی ئیمانە، واتە: ئەگەر بەدڵ ڕقی نەبوو لێی ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە ئیمانی کزو باوەڕی لاوازە، چونکە ئەگەر بۆ دەست و زبان مەرجێك هەبێ ، مەرج بۆ دڵ ودەروون نی یە،

بەڵام -برایان !- با لەگەڵ خوای خۆماندا ڕاست بین و بە ڕاستی ناپین بگرین، بەخەیاڵ نابێ هەندێ شت دروست بکەین و بیکەین بە بەهانەو بیانووی بێ دەنگیمان و دوورە پەریز بوەستین.

کێ دیویەتی بەرامبەر بە واتەیەکی حەق لەم ڕۆژەدا تووشی زیانی ماڵی و لەشی بووبێ؟ یا بەسوکی و ڕیسوایی یەوە سەیری کرابێ؟

ئێمە بەخەیاڵ -بەرامبەر بە خۆشەوستیی دنیا-بەڵگەی بێ دەنگی بۆ خۆمان دائەتاشین و لەڕاستی لائەدەین وزانست و زانیاریمان فەرامۆش ئەکەین، دیارە بەم کارەمان لەلایەکەوە ماوە ئەدەین فەرمان ڕەوا لە هێڵ لابداو، خۆشمان لەتەکیا هاوبەش بین، وەلەلایەکی کەوە بەم لادانەمان بەر ئەفرینەکەی پێغەمبەر ئەکەوین.

کەسێك بە ڕاستی ڕێگای خوا بگرێ و لێی بترسێت، بێ گومان فەرمان ڕەوای ڕۆژیش لێی ئەترسێ و شەرمی لێ ئەکات، لەوانەیە واز لەتاوانەکانی بێنێ و ڕوو بکاتە خوا.

ئەگەر زانایان ترسی خوایان لە دڵدا نەبێ، فەرمان ڕەوای ڕۆژیش نرخیان بۆ دانانێ و بەسوکی سەیریان ئەکات.

( فخر ) ی من ! لە ڕوو دامەمێنەو مەفهوومی ئەم نامەیەم بگەیەنە بەجەنابی ( مدرس ) [1]

و پەردە لەڕووی ڕاستی لادەو بی گەیەنە بەکۆمەڵ.

بنەماڵەی ئێوە بەتەقواو زانست و پاکی بەناوبانگە، دەبوو هەر لەسەرەتاوە مەوداو ماوەت نەدایە بە ( مدرس ) ( خواسەلامەتی بکات ) بەو تەعبیرە ئالۆزو پڕوپووچانەوەو بەو شێوە نەشیاوەوە نامە بۆ من بنووسێت-چونکە لەم شوێنە پیرۆزەدا (واتە دێی تەوێڵە-وەرگێڕ) ڕۆژی بەدەیان زاناو

---

[1] لەمە تێ ناگەم، مەولەوی ڕاستەو خۆ بۆ نامەکەی نەناردووە بۆ (مدرس)؟ بۆ لەنێوان مەولەوی و (مدرس) و فەرهادمیرزا دا (فخر العلما) بووە بە پردی پەڕینەوە؟ .

بلیمەت لە هەموو گۆشەیەکی دوورو نزیکی کوردستانەوە وەکو پەروانە لە دەوری چرای ڕوخساری شێخ [٢] کۆنەبنەوە، لەوانە مەلا عوسمانی[٣] سلێمانی و مەلا ئەحمەدی نودشی [٤] و. مەلا عەلی تاڵشی و مەلا ( عبدالله ) ی داغستانی[٥] ( خوا بیانهێڵێ ) ئەم بەڕێزانە لەهەموو ڕوداوێك و هەموو نامەیەکی ئیجابی –یاسەلبی بێ ئاگانین و ئەی بیستین و ئەکەوێتە بەر چاومان.

جا ئەگەر نامەیەکی پرو پوچی وەك نامەکە ( مدرس ) ببینن ( وەکو بینویانە-وەرگێڕ ) ئەبێ- جگەلەئەنگی ونوشوستی- چ پلەو پایەیەك بۆ ئەو نامەیەو بۆ خاوەنەکەی دائێن؟

لە من ئاشکراو ڕۆشنە ئێوەی بەڕێز لەم جۆری کارانە بەرین، ئەزانم ئێوە بەشێوەی نامەکەی ( مدرس ) نارازین و پێتان ناخۆشە ئەگینا قەلأێ بەرزی سەدان ساڵەی ئێوەشی پێوە ئەڕوخێت و ناوتان بە خراپە ئەزڕێ.[٦] مرۆڤ لای ( ئەسناس )[٧] چۆن بکەوێتە بەرچاو گرنگ نی یە، بەلأم لای کۆمەڵی بلیمەت و پایە بەرز ئەبێ بە جوامێری و وشیاری ببینرێت و بکەوێتە سەر زبان. ئەگینا خاوەنەکەی سووك و ریسوا ئەبێ .

من لە وەلأمدا ڕووی قسەم لە تۆ ئەکەم، چونکە لە ئازایی و زانست و ژیریتان دوودڵ نیم،بەتایبەت کەجەنابی ( مدرس ) نووسی بووی : ( من لە ( فخر العلما ) م پرسی: کێ ئەم نامەیەی نووسیوە؟ حەزرەتی فەخر بە زەردەخەنە، بە قسە، بە خامۆشی، بە نیگا، بە ئاماژە، فەرمووی نامەی مەعدوومە . . . ).

---

[٢] مەبەست پێی (شێخی بهاء الدین ) ە ، لەوکاتەدا مەولەوی لەتەوێڵە بووە. نامەکەی ( مدرس ) بەرچاوی شێخ و مەلاکان کەوتووە.

[٣] مەلا عوسمانی (١٢٤٠-١٣٠٧) ك. کوڕی حاجی ئیسماعیلەو دانیشتووی شاری سلێمانی بووە. لەهەمان کاتدا شاعیرو نازناوی (فایق) بووە. خەلیفەی شێخی سیراجەدین بووە. دیوانی شیعری (بە کوردی و فارسی و عەرەبی) هەیەو، لەلایەن ئەمین موتابچییەوە لەچاپدراوە لەخانەقاکەی خۆیدا – کەبەخانەقای حاجی مەلا عەلی بەناوبانگە–نێژراوە.

[٤] ئەمزاتە لەئاسمای کوردەواریدا– بەتایبەت لە فیقەو شەریعەتدا– وەکو ئەستێرەی گەلاوێژ دەرەوشاوەتەوە، بەلای عەلادین سەجادی یەوە مەولەوی لای ئیجازەی وەرگرتووە.

[٥] لەژیانی ئەم دوانەی دواوەوە بێ ئاگام.

[٦] نامەکەی (مدرس) دوور بووە لەگیانی ئایینی یەوە و حەرام و حەلاڵی پێکەوە تێ هەڵکێش کردووەو حەقایەتی کردووە بەژێرەوە.

[٧] مەیموونی نازیرەك ، لێرەدا مەبەست ئینسانی نازیرەکە.

کەواتە فخری من ! ئەگەر لەو ئاماژەیەتدا پەنجەت بۆ حەقیقەتی نامەکەی من ڕاکێشاوە، بەڵام (مدرس) تێی نەگەیشتووە، ئەوە بەجێ یە، چونکە ئێوە و نموونەتان بەم جۆرە ئاماژەیە شایانن، ئەگینا چ دلێری یەکت کردووە؟ بە کینایەتێك کەلە (صریح) بەهێز ترە خۆت بئاڵێنی بە ڕەوشت نزمان و ناحەق پەرستان!!

هەرچۆنێ بوبێت، چونکە پەی بردن بەڕاستی دەگەڕێتەوە بۆ هێزو پێزوبڕشتی (سوڵتانی ئیستیدلال) لەبەر ئەوە لە دوو لقی گومانەکە لقی دووەمیان هەڵئەبژێرم و[8] پاڵێوتەی بڕگە گرنگەکانی (مدرس) بەشێوەی خاڵبەند ئەهۆنمەوە و یەك بەیەکیان ئەدەم لە بیژەنگ ... لامیان ئەدەمەوە !

یەکەم: دەربارەی سوپاس و ستایشی بۆ جەنابی (والی) سەری خۆی ئێشاندووە، چونکە بەڕێزیان لەبەر داد پەروری و ڕەوشت و خووی بەرزیان..

پێویستی بە سوپاس و ستایش نی یە و وەکو تەحصیلی حاصیڵە ، هەموو دانیشتوان شارەزاو بەسەر ڕەوشتە بەنرخەکانیان ئاگادارن.

جەنابی (مدرس) لە ستایشەکانیدا گەلێ سەرەڕویەو لە هێڵی ڕاستی و ئاسایی چۆتە دەرەوە، وەك ئەیبینی (غولام شاخان) ی گەیاندۆتە پلەی پێغەمبەرێتی !! بەم پێوانەبێ ئەبێ جەنابی (والا) [9] لە پلەی خواییدا بێ، چونکە بە دیمەن و ڕواڵەت و بە پێی ئاگاداری ئێمە و ، بە پێی باوەڕی دەستەی ڕەش و ڕووتان جەنابی (والا) گەلێ لە غولام شاخان-بەرامبەر بەهەژاران و بێ ئەوایان- بالاترو بەبەزەیی ترە . [10]

دووەم:

(مدرس) فەرموویەتی: (شیعر)

---

[8] چونکە موناسەبەتەکە نازاندرێت مانای نامەکە بەجوانی نومایان وئاشکرانی یە، تا نامەکە(مدرس) نەبینوٚت هێماکانمان بۆ ڕوون نابێتەوە.

[9] (والا) واتە بالا، نازناوی ڕەشمیی فەرهاد میرزایە.

(١) [10] لێرەدا مەولەوی مەبەستی ئەمەیە:

سوپاس کردن و پیاهەڵدان بەفەرمانڕەوایاندا بەرامبەر بەدادپەروەری یان و ڕەوشت و خووی مرۆڤایەتی یان .. ڕەوایەو ناشایستە نی یە، بەڵام بەمەرجێ لەو سوپاس و ستایشەییاندا -بەتایبەت لەسەردەمی فەرمانڕەوایی یاندا- لە هێڵی ئەریتیو لەسنووری شەریعەت نەچنەدەرەوە زیادە ڕەوینەکەن،بەڵام (مدرس) لەستایسشەکەیدا گەلێ لای داوەو لەڕاستی دوورکەوتۆتەوە.

.....................[11]

ساقى مگر وظيفه ء ( حافظ ) زياده داد

كاشفته گشت طره ء دستار مولوى

زۆرم پێ خۆشبوو ناوی (لسان الغيب) ت[12] هێنا، بەڵێ ڕاستە . بەهۆی نەشئەی بادەنۆشیی خۆشەویستیی شێخەوە (شێخی بەهادین- وەرگێڕ) کە پیری مەیخانەی بەختەوەری یە، مەولەوی سەرخۆشەو تورەی میزەرەکەی تێك چووە[13]

ئەم تێك چوونە کەبەهۆی خواردنەوەی ئەو بادەیەوە بەسەرم هاتووە، بوە بەهۆی کۆبونەوەی هەزاران فەڕو بەرەکەت، بەزمی ئاشکراو نهێنی و بۆنی عەنبەری بەهەموو لایەکدا بڵاو بۆتەوە:

تا ابد بوى محبت بمشامش نرسد

هركه خاك درى ميخانه بر خساره نرفت

بەڵام ئەی (مستولی) بە سەر مەدرەسەی پڕ وەسوەسەوە! ئایا نەتدیوە ؟ وەی ئەی سر پەرشتی کەری (ئەوقاف) ! ئایا نەکەوتۆتە بەر گوێت ؟.

فقيه مدرسه دێ مست بودو فتوى داد

كه مێ حرام، ولى به زمال اوقاف است [14]

---

(11) نێلێوهعلووەمیێم ساغ نەبووە.

(12) -خواجە حافظی- شیرازی ڕەحمەتی خوای لێ بێت-لسان الغیب- ناوبانگی ڕۆیشتووە، بۆیە مەردومان بەگشتی بۆدەنگ و چەڵەمەی دەروونی خۆیان پەنا ئەبەنە بەر دیوانەکەی و بەفاڵ ئەگرینەوە..

(13) وشەی- مەولەوی – لەبەیتەکەی (خواجە حافظ) دا مرۆڤێك بووە لەسەردەمی (خواجە حافظ) دا ژیاوە. ئەو مەولەوی یە بە وتەی (حافظ) بادەی زۆری خواردۆتەوەو سەرخۆشی کردوەو لەبەر ئەوە تورەی میزەرەکەی تێك چووەو ئاگای لەخۆی نی یە، (مدرس) یش مەولەوی دەچوێنێ بەو مەولەوی یەوە کە (حافظ) هەجوی ئەکاو دای ئەشۆرێ، مەولەویش بەبەڵگەی حوسنی تەعلیل ئەڵێ بەڵێ سەرخۆشم، بەڵام سەرخۆشی یەکەم بەهۆی بادی نۆشیی خواپەرستییەوەیە نەك بادەی شەیتانی.

(1) [14] بەیتەکە لام وا بەیتەی (حافظ) شیرازی یە، مەعناکەی:

(2) زانای زانستگەی زانێ- دوێنێ- یا زستان ئەم فتوایەی دەرکردو وتی: مەی ، خواردنەوەی حەرامە، بەڵام گەڵێ لەخواردنی ماڵی ئەوقاف باشترە.

(3) ئەم بەیتە لەلایەن مەولەوی یەوە وەڵامی ئەو بەیتەیەکە (مدرس) لەبڕگەی (دووەم) یدا هێنایەوە (ساقی مگر وظیفە (حافظ) ...هتد) ، (مدرس) واتە شێخ یوسف لەجێگاکەی (شێخ عبدالقادر) ی موهاجیردا کرا بە (مدرس) ی مزگەوتی (دارالاحسان) ئەم مزگەوتە لەلایەن (امان الله خان) ی والی دروست کەری ئەم مزگەوتەوە چەند گوندێکی لەسەر مزگەوتەکە وەقف کرد، بۆ دەستەی فەقێ و مەلا و خادیم... فەرهاد میرزای قاجاری وەك تەدریسی دا شێخ یوسف ،

ئێمەی دەروێشان هەمیشە مەست و سەرخۆشی بادەی خۆشەویستیی خواین و، بۆ بەجێ هێنانی هەموو کارانی دنیاییمان جگەلە پەیڕەوی کردنی شەریعەتەکەی سەرچاوەیەکی ترمان نی یەو، لەدایەریەرەی فەرمان بەچاکەو قەدەغەکردن لە خراپە ناچینە دەرەوە، ئەم حاڵە لەکوێ و حاڵی (مدرس) لە کوێ؟

این رە کەتو میروی بترکستان است

سێ یەم:

(مدرس) منی بەسپلە داوە لەقەڵەم، چونکە دیاری یەکەی (والا) م گێڕاوەتەوە و پێی ڕازی نەبووم، وەئەڵێ: (لە جیاتی ئەو دیاری یەی (کتێبەکەی (سبط) ی ابن جوزی- وەرگێڕ) ئەگەر زێڕو زیو بوایە وەری ئەگرت و بۆی نەئەناردەوە...)

گوایە بەگێڕانەوەی خەڵاتی شایانە من ئاخیم بڕیەوەو جاریکی تر ئەو خێرو فەڕە بەچاو نابینمەوە).

(مدرس) بەم شێوە ناپەسەندو ناڕەوایە کەهەڕەشەو گوڕەشەیە، تیری بەد گۆییم تێ ئەگرێ و شەرم نایگرێ!! بەڵام فەخری من (من ئەڵێم: خەڵاتی شایانە لای پاکان و خاوەن ڕەوشتان (کلی) بێ یا (جزئی) ئەبێ بی جێی شانازی، وەزێڕو زیویش ئەبێ دڵ وەری ئەگرێت، بەمەرجێ دیاری یەکە بێ تویکڵ بێ و تەنیا بۆ مەبەستیی خۆشەویستی بێ، لەلایەن ئێمەوە ئەو دیاری یەبەفراوانی جێی خۆی گرت،بە مەفهوومی (من لم یشکر الناس لم یشکر الله) سوپاسی (والا) مان کردو خستمانە سەرچاومان، بگرە بەرمبەر بەو دیاری یەکی دەروێشانەمان دا بە فروستادەکەی وزۆر بە ڕێزەوە جیاکردنەوەی (کلی) لە (جزئی) بەتەنیا شێوەی (مدرس) ە

کار پاکانرا قیاس از مگیر

گرچە باشد درنویشتن شیر شیر

لێرەدا لەنێوان ئەصڵ و فەرعدا بەئگەی هاوبەشی نی یە قیاسەکە گەلێ جیاوازی لای زانیانی مە نطیق (کلی) (جزئی) یەو (جزئی) (کل)ە.

دەربارەی گێڕانەوەی کتێبەکەی (سبط) ی (ابن الجوزی) هیچ خۆم بەسپلە نازانم، من هەمیشە ڕێزگرتنی پیاوی گەورەم لایەو لەبەر چاوەمە، بەڵام بەپێی وتەی پێشینان (لەم عەسا بۆ ئەو

---

هەروەها دێهاتە وەقفەکانیشی دایەو بەرەسمی کردی بە (مستولی) و سەرپەرشت کەری ئەو وەقفانە، جابە پێی وتەی مەولەوی (مدرس) لە خواردن و یاری کردن بەماڵی ئەوقاف قصوری ئەکردووەو ئەڵێ: کەواتە ئەگەر من سەرمەست و سەرخۆشی بادەی حەرام بم؟ ئەوە گەکەلێ سووکترو هێواش ترە لە یاری کردن بە ماڵی ئەوقاف.

عەسا) جیاوای یەك هەیە لە نێوان دیاری یەكدا كەبەناوی خۆشەویستی یەوە بێ و دیاری یەكی ترا كەبۆ بەدی هێنانی مەبەستێكی تایبەت بێ، ئەم دوو دیاری یە چ لە ڕواڵەت و دیمەنداو چ لەماناو ئەریتیدا زۆر لەیەكتری یەوە دوورن.

ئەو كتێبە بەرامبەر بە یارانی پێغەمبەر پڕبوو لە تانەوتەشەرو وتەی ناپەسەند بۆ نموونە بڕوانە بابەتی (ذكر ماجرا له بعد وفاة امیر المؤمنین...) كەلەوێدا چۆن دواوە؟ پشتی بەقسەكانی مەلا مەحموودی زمەخشەری یەوە بەستووره، كەگۆشەگیر (معتزله) یكی بەد باوەڕ بووەو لە بنەڕەتدا جێی گومان و گومڕایی یەو، زانستەكەی لەنەزانین بەو لاوە هیچی تر نی یە وبێ سوودە، بەشێوەی بێ ڕەوشتانە جنێوی داوە بە پیاوە گەورەكان و داونیەتە بەر تیری تانە، جنێو دان بە پیاوی گەورە و پایەدار لە پیشەی ئینسانی شەریف نی یە ، شەرف و پلە بەرزێتی بە ڕەوشتە، نەك بە ڕەگەز و نەژاد و بنەماڵە،بە پێی ئایەتی (فاذا نفخ فی الصور فلا انساب بینهم یومئذ-المؤمنون ۲۳) وەبە فەرموودەی (اتونی باعمالكم ولا تاتونی بانسابكم) وەهەروەها بە فەرموودەی (اهل بیتی هؤلاء یرون انهم اولی الناس بی لیس كذلك) پرسیار لە كردار ئەكرێ ، نەك وترا –نەژاد و ڕەگەز و ڕەگی بنەماڵە.

بە وتەو گەواهی دانی خوداو پێغەمبەر هەموو یاران ڕاست و ڕاست گۆن، كام قاضی و كام مودەریس ئەتوانێ وتەی ئەم دوو شاهیدە بریندار بكات؟ [15] لەلایەكی كەوە جگە لەو كەم وكوڕی یانەی كەتیایدا بەدیم كردن، زۆربەی لاپەڕەكانی مۆری تایبەتی جەنابی (والی) ی پێوە بوو، سەرم لەوە كردەوە كە ڕۆژێ لەڕۆژان بەر چاوی لێ پرسراوانی دەوڵەتی عوسمانی بكەوێ و، لەڕێگای منەوە لە نێوان هەردوو دوڵەتەكەدا ناكۆكی ڕوو بدات، جالەبەر ئەمانەو چەند هۆی تر تر كتێبەكەم بۆناردووە، دیسان ناردنی ئەو كتێبە بۆ من بەناوی دیاری یەوە پەیامێكی پیرۆز نەبوو وەجێی پرسیار بوو..

لەم وەڵامەمداو لە لقێك لە لقەكاندا مەبەستم پێی ئەوە نەبووە كەڕەخنە لە (والی) بگرم و بەو بۆنەیەوە دیاری یەكەی بكوتمەوە بە ناو چاویاو، بەڵكو تیایدا پرسیارم لە فەلسەفەی ناردنی كتێبەكە كردووە.

---

[15] مەولەوی لە باوەڕنامەكەیدا (العقیدة المرضیة) دەربارەی یاران دوو بەیتی فەرمووە، بەگونجاوی ئەزانم كەئەو دوو بەیتە لێرەدا بنووسم، ئەمە دەقی دوو بەیتەكەیە:

خوداو پێغەمبەر لەمەدحیاندا

دوژمن لەنەقدو لەقەدحیاندا

توخوا پێم بڵێ تۆوە پەنهانی

ئایا (ولا مناقشة فی الاصلاح) فریشتەکان کە وتیان :(اتجعل فیها من یفسد فیها و یسفك الدماء...)
مەبەستیان ئەوە بوو ڕەخنە لە خوا بگرن؟ یا مەبەستیان ڕوون کرنەوەی فەلسەفەی کارەکە بوو؟
جەنابی (مدرس) ئەڵێ : مەولەوی بەم وەڵامەی دەیەوێ فیتنەو ئاژاوە لەنێوان ئەم دوو دەوڵەتەدا پەیدا بکات، نەخێر . ببورەو چاوێ هەڵبڕە ئاژاوەگێڕ بناسە!!
ئەوەی لە نامەی پێشوودا بۆ (والی) م نووسیوە، جگەلە ئامۆژگاری نیازێکی ترم مەبەست نەبوو، ئاشکرایە پیاوانی خاوەن پلەو پایەی بەرز نەك بڵێم بەتەنیا ئامۆژگاری وەرناگرن و بەس بەڵکو بەدڵ فراوانی و بەسوپاسەوە وەری ئەگرن و پێی ئەگەشێنەوە. ئایینی سولەیمان پێغەمبەر بەو هەموو توانایەیەوە مێژوویەیەکی ئەدواند!!
جەنابی والی چونکە بە تینی ورد بینی خۆی لە نامەکەم گەیشتبوو، وەڵامێکی ڕێك و پێکی بێ توێکڵی بۆ نووسیمەوە، بەڵام (مدرس) بە تێبینی کورتی وەڵامێکی ناپەسەندو تێك شکاوی بۆ نووسیبووم کە هیچی بەسەر هیچەوە نەبوو.
خووی ڕەوشتی ناشیرین و ناپەسەند ئەوەیە، هەرکاتێك فەرمان ڕەوای ڕۆژ بەحوکمی (وشاورهم فی الامر) ئەگەر پرسیارێکی ئاراستە کردیت لەوەڵامەکەتدا دەبێ ئاگات لە حەق و ڕاستی و بەرژەوەندی گشتی بێت و،لە ترسی ئەو فەرمان رەوایەی خۆت، ئەهاویتە چاڵە تاوان و ناڕەوایی یەوە پێش هەموو شتێك لەم هەڵوێستانەدا دەبێ خوای گەورەت لەبەر چاو بێ و لە ڕێگای ڕاست و ڕەواوە بڕۆیت.
بەدی هێنانی کاری مرۆڤایەتی هەرگیزاو هەرگیز ئاژاوە دروست ناکا.
این رە کە تو میروی بە ترکستان است
من دەروێشێکی بێ باکم وەبەتایبەت ئەوەی پاکی پێغەمبەرو ئەتیجە و ئەنجامی عەلی وفاتیمەی زەهرام، قسەی حەق هەر ئەکەم و پەروام لەکەس نی یە و لەکەس ناترسم، جەنابی والی لەمە بێ ئاکا نی یەو باشی ئەزانێ، کەواتە بەڕێزیان بەوتەو واتەی ئەم و ئەو ئاوێنەی حیلمی تۆزو گەرد ناگرێ، من خوا دروستی کردوم و هەر ئەویش بەر پرسیارە لە ژیانم.
(مدرس) ئەفەرموێ: ئاوەرۆك و ئاواخنی کتێبی ئاوبراو لە وتەی کەڵە زاناکانی سوننی وەرگیراوە.
منیش ڕام وانی یە، چونکە لەلایەن جێگیر (ثبوت) بوونی (گشت) (مجموع) بە بوونی ئەجزایە، بەڵام لەلایەن (نفی) یەوە بەدی نەهاتنی (گشت) بەبەدی نەهاتنی (تاك) (جزء) یکیش پەیدا ئەبێ، ئەوەی ئەو دائەرە ئەیەوێ، چونکە (ثبوت) ەو بۆ ئیسپاتی (گشتە) ئاشکرایە بۆی ناچێتەسەر و تیایدا سەرکەوتوو نی یە، بەڵام ڕاوبۆچونەکەی من لەبەر ئەو بەمەبەستی بەدی نەهاتنی گشتە، لەڕووی چەسپاندنەوە زۆر بەجێ یەوزۆر لەبارو گونجاوەو ئارێکی تیادا نی یە.

له چ كتێبێكی سوننەتدا جنێو ئاراستەی یارانی پێغەمبەر كراوە؟ كەواتە بە گشتی و بە موتلەقی لەزانایانی سوننەت وەرنەگیراوە.

( مدرس ) ئەڵێ : ئەو وتانەی كەلەو كتێبەدایە بە تاك تاك و كۆ كۆ بەشێوەی بڵاوی لە كتێبەكانی ( سیرە ) و لە وتەی زانایانی سوننەتدا هەیە و دەبینرێن، بەڵێ وایە بەمەرجێ حەرام و حەڵاڵ و ڕاست ودرۆ بەیەكدا هەڵنەشێلێ.

وەئەڵێ: ( كتێبەكە بەتەنیا وتەكانی ئەوان كۆ ئەكاتەوەو لێیان ئەدوێ و ڕوونیان ئەكاتەوە )

بەڵام من و ( مدرس ) و وێنەمان ئەڕا پەڕین و ئەمەلەوانی دەریای زانست ، بەڵكو عەوام ئاسا وتەی ڕاست و چەوت لێك جیاناكەینەوەو ئاگامان لە پەیوەستی سەنەد نی یە، وەبەسەر چۆنێتی ژیانی گێڕەرەوە ( رواە ) ە كاندا شارەزاییمان نی یە، چی لە ( خاص ) و ( عام ) و ( ناسخ ) و ( منسوخ ) و هۆكانی هاتنە خوارەوەی ( نزول ) ئەزانین؟

كتێبی ناوبراو لای من جێی باوەڕو متمانە نی یە، بۆمان نی یە لە خۆمانەوە ئایەت و فەرموودەی ( مسكوت عنها ) بكەین بەبەڵگەی كردار و تەمان، هەر وەك ( مدرس ) لە كتێبی ( فتح المبین ) دا لەباسی تەقیەدا وەری گرتووە.

لێرەدا كاتی ئەوەیە بەبێ تەقیە لەمانای ( تەقیە ) بدوێم:

( ماهیە ) ی بەش كراو ( مقسم ) لەنێوان لقەكانیدا هاوبەشە، جوێ بوونەوەی لقەكان لەیەكتری بە ( قید ) ی دژو پێچەوانە دیاری ئەدا، شتنەوەو لابردنی لقێك لەو لقانە سەرناكێشێ بۆ شتنەوەو لابردنی لقەكانی تر ، بۆنموونە :

( ماهیة ) ی ( غبطة ) و ( حسد ) و ( حقیقة ) و ( مداراة ) و ( تقیة ) لەیەك شت پێك هاتووە، بەڵام ئەو قەیدانە هەریەكەیان بەقەیدێكی تایبەت و بە ( حیثیة ) ێكی جیاواز لەیەكتری جیا ئەكرێنەوە.

ئەوەی من لە یارانی پێغەمبەردا لام بردووە و شتومەتەوە حەسەدی ناشایستەو تەقیەی ناڕەوایە، نەك ( غبطة ) و ( مداراة ) ی پەسەند بەجێ.

كەواتە جەنابی ( مدرس ) نەبۆنی ( اربعین ) ەی شەرحی ( فتح المبین ) داوێتی لە دەماخی و نەگوێی لەهەورەگرمەی ( صواعق ) ەوە بووە.

پێنجەم:

( مدرس ) سەرپاكی نامەكەی مەعدووم مەڵحەمێك بوو لە خۆشەویستی و ڕق و قین پێك هاتبوو. نەیزانیوە ( ماهیة ) ی خۆشەویستی كەی باشەو كەی خراپە؟ خۆشەویستی و قینی ئێمەی دەرویشان تەنیا بۆ برەوپێدانی شەریعەت و ڕازی بوونی خراپە و هیچی كە.

شەشەم:

( مدرس ) ئەفەرموێ: کتێبی ( تجرید ) [١٦] کە ( جلال الدین ) ی دەووانی پەراوێزی بۆ نووسیوە پڕە لە ڕای جیاوازی جۆر بە جۆر لە چەندین پێچەوانەی زەق و لە تانەو تەشەری لەسنوور بەدەر ).

هێشتا نەیزانیوە ( تجرید ) دانراوی کێ یەو پەراوێزەکەی لە چی دەدوێ و مەبەستی پەراوێزەکان چی یەو لە چی ئەکۆڵنەوە.

( مدرس ) بەم وتەی ئەگەر ئەیەوێ بڵێ: وەك چۆن لەکتێبەکەی ( سبط ) دا تانەو توانج .. هەیە هەرواش لە ( تجرید ) دا دیسان بەهەمان دەقەوە هەیە. ئەوە-بەبێ ئەوە خۆی پێی بزانێ بۆچونەکەی من ئیسپات ئەکات و داواکەی منی پێ ئەچێتەسەر ، کە جنێودان و توانج لە نوسراوانی بنەماڵەی سوننەتدا نی یە، وەئەگەر مەبەستی ئەوەیە ، وەك چۆن من بەرپەرچی ( سبط ) م داوەتەوە، هەروەها گەرەکە بەرپەرچی وتەکانی تەجریدیش بدەمەوە.

ئەمەش من هیچ بە پێویستی نازانم، چونکە زانایانی دێرینەمان ( خوایان لێ ڕازی بێ ) شتێك نەماوەتەوە نەیڵێن و نەینووسین، هەموو گوتراوێکیان هەڵسەنگاندووەو شەن وکەویان کردووە، من هەر ئەمەندە ئەڵێم و ووتومە : ئەو کتێبە بەو قسانەیەوە دانراوی ئەهلی سوننەت نی یە.

دیسانەوە ( مدرس ) بەرامبەر بەڕوون کردنەوانەیەم کە دەربارەی ڕەاست بیژیی زانایانی سوننەت وتوومن بە گومانی خرا پم ئاراستەی موسڵمانان کردووە.

یەکەم:

یا ( مدرس ) ئەوە بزانێ من دووراو دوور گومانی خراپکاریم نەداوەتە پاڵ هیچ تاك و کۆیەك. بەڵام نزیکاو نزیك تانەو توانج و جنێوی یارانم لەو کتێبەدا دیوە.

دووەم:

ڕێبازی هۆزی حەق گۆیان هەرکاتێك کە ڕووخساری پرشنگداری خۆی بخاتە ڕوو منی هەژار بنووسم یا نەنووسم وەك یەکەو ئەنجامەکەی نمایانەو، لە خۆیدا بەرپەرچە بۆ هەموو ڕێبازێك کەبەرامبەری وێستابێ.

باب و رنگ و خالّ و ( خط ) چە حاجت روی زیبارا

جەنابی( مدرس ) وای گومان بردووە کە من دەربارەی مزگەوتی ( دارالاحسان ) عەرزی ( والا ) م کردووە، کەبیگێڕێتەوە بۆ جەنابی ( شێخ محەمەد جەسیم ) بە مەرجێ منی هەژار-جگەلە داوای گێڕانەوەی مانگانەکەی بۆ ماڵ و منالەکەی —هیچی ترم نەوتووەو باسی ( دارالاحسان ) و داوای

---

[١٦] لە کتێبی (تجرید) دانراوی نصرالدین طوسیە – نەك جلال الدین

لابردن ودانانی کەسم نەکردووە، لەم ڕووەوە چی بڵێم وی بنووسم زیادەو ناپێویستە چونکە ( شێخ محەمەد جەسیم ) بەهۆی ئەو زانین هونەرانەیەوە کە خوای گەورە پێی بەخشیوە، بەڕێزیان لە هەر گۆشەیەکدا جێگیر بێ هەرچەند تەسك وتیژو حادە بێ بۆ ئەو دەبێ بە بەگ گۆشەی کراوەو ( منفرجە ) و بە ( دارالاحسان ) ، شکۆمەند بە پیاوەوەیەیە نەك بە شوێن وجێگاوە، بەڵام جێی داخ و هەناسە هەڵکێشانە کەهەمیشە گەردوون دژی زانایان و هونەرمەندانە، هەندێ گاڵتەیان پێ ئەکەن ( والله یستهزیء بهم ویمدهم فی طغیانهم یعمهون ) دەستەیەك بە گێل و گەمژەیان ئەزانن، ( الا انهم هم السفاء ولکن لایعلمون ) کۆمەڵێك بە دێوانە و شێتیان ئەزانن، بەمانە بڵێ : سوێند بە خودا ( وماصاحبکم بمجنون ) ( بل هو سلطان مبین ) ئەم زاتە بەتەنیا یەك ئەنگی تیایە ئەویش ئەوەیە ئەڵێ: خودا یەك و تاك و تەنیایە. وەلەهەمانکاتدا لەسەری سوورو بەردەوامە.

حەوتەم:

( مدرس ) : ( ....... )[١٧]

سوپاس بۆ خوا من قسەی ڕاست و دروست ئەکەم و کردوومە، ئازایەنەو دلێرانە دێمە مەیدانەوەو ڕای بەجێ دەرئەبڕم، شەرم لەکەس نی یەو، لە خوا ئەبێ ترس و بیمی کەسم لە زاتا نی یە، وەکو ( مدرس ) نیم لە دەربڕینی حەق و ڕەوا خۆم دوورەپەرێز بگرم و گۆشەگیریم، پرسم پێ بکرێ و بە شێوەی دووڕوویی بێمە ئاراوە!.

ئێمە ئەبێ لەحەق و لە دەربڕینی ڕاستی لانەدەین، وەکو پێویست پێویستە ڕوو لە مافیرەوا وەرنەگێڕێن، تالەلایەکەوە فەرموودەکەی پێغەمبەر کەئەفەرموێ : ( الدین النصیحە.. ) بەسەر خۆماندا دابڕین و وەلەلایەکی کەوە ، بۆئەوەی گومان ئەبرێت کەلەناو کوردو کوردەوایدا پیاوانی لیهاتووحەق گۆ نی یە[١٨]. چونکە جگە لە مەولانا خالید ( قدس الله سره ) کە کوردێکی پایە.بەرزو شوێنەواری دیارە-سەدان زانای کورد پایەبەرزی ترمان هەیە گەردوون پێیانەوە ئەنازێ، وەکو جەنابی ( موفتی ئەفەندی زەهاوی ) کەلەهۆزی گەورەی جافەو بەکوردایەتی خۆیەوە شانازی ئەکا.

---

[١٧] چەند دێڕێکی ئاڵۆز شپرزە بوو بۆم نەخوێندرایەوە، ناچار شوێنەکەیەم بە بۆشی هێشتەوە. بە پێی وەڵامەکەی مەولەوی ئەبێ وتبێتی : شەرم ناکاو قسەی خۆی ئەکات.

[١٨] مەسەلەکە فەرهاد میرزایە کە ئەویش فارسەو لە کێشەی ئایینیدا ڕەگەز پەرست بووە واتە بۆئەوەی فەرهاد میرزا وا نەزانێ کە کورد پیاوی بەرزی تیادا نی یە، ئەبێ لە هەموو لایەکەوە بەرامبەر بەم جۆرە مەسەلانە بێ دەنگ نەبین.

( مدرس ) ئەفەرموێ: ( پێویستە لەگۆڕینەوەی ئارادا دڵت گەرد نەگرێ ). منییش ئەم وتە بەنرخەی بەڕێزتان بۆ بەڕێزتانی دووبارە ئەکەمەوە کە ئەبێ دڵ ئێشان لەئارادا نەبێ.
ئەگەر ئێمە سەر بەبنەماڵەی سوننەتین و پەیڕەوی ئەوانین ، پێویستە وەکو ئەوان دەست و زبان و پێنووسمان بەهەموو توانایەکی گیانی و داراییمانەوە-بەمەبەستی هاندان بۆ مرۆڤایەتی و قەدەغە کردن لە خراپە- بخەینە کار، هەمیشە حەق گۆ بین ولەکەس نەترسین.
وەئەگەر سەر بەبنەماڵەی سوننەت نین، وەلە هەمانکاتدا ئەدەب و ڕەوشت و کردارمان شێوەی هیچ کامێکیان نەبێ، بێ گومان مەفهوومی ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر) ئەمانگرێتەوە :( اذا لم تستح فاصنع ما شئت ).
من بەم هەستەوە ئەڕوانمە ئایین ، لەم ڕۆژەدا کە ( بدأ الدين غريبا وسيعود غريبا ) و ( الشريعة تحت ظلال السيوف ) ئایین کزو لاواز بووە، مەودای شیرو تیری ( الامر بالمعروف والنهى عن المنكر ) ی ئەوێ، لەم ڕۆژگارەدا دین کەوتۆتە دەست فەرمانڕەوایانی کەم تەرخەم و هەوس پەرست و دنیا دۆست.
کێ لە قسەی بەرزی ( فخر العلما ) ئەپرسێ و ئەترسێ؟ کێ لەوتە و نووسینی من ئەکۆڵێتەوەو گوێی بۆ ئەگرێ؟.
چو دریای قدر جنبش نما يد
زبانگ غول بيسامان چه أيد؟
مەگەر خۆمان هەڵ بگرین تا کاتی هاتنی ( مهدی ) ی ئێمە لەبە تحا ( بطحا ).وەو.یا ( مهدی ) ی ئەوان لە بیری سامەڕاوە.
مەعدووم

# وشەی سوپاس

ئاواتم ئەوە بوو بەو شێوەیەی دڵ پێی خۆشبێ و بگونجێ لەگەڵ شکۆمەندیی ئەم زاتانەی خوارەوەدا کە بەرووی گەش و بەخەندەی لێوەوە لایان لێ کردمەوەو ئاوڕیان لێ دامەوە، بەرامبەر بەو پیاوەتیەیان لەگەڵ مندا کریان -کەهەریەکەیان بەچەند لاپەڕەیەك لەم دیوانەدا مێژووی ژیان و جوامێری یان بنووسم ن بەڵام بەداخەوە لە توانامدا نەبوو بەڕاستی دەربارەیان قەڵەم کوڵ و زبان لاڵە:

١- بەڕێز کاك عومەر حەمە عەلی ڕۆستەم لە دێی چەرمەگا لە سلێمانی.

٢- بەریز کاك سەردار جاف کوڕی داود بەگی جاف لە بەغدا.

٣- بەڕێز کاك فوئاد شێخ حەسەن لە سلیمانی.

٤- بەڕێز کاك عومەر نووری حاجی حەمە سوور لە سلێمانی.

٥- کاك حسەین عوسمان مەعرووف نێرگسەجاڕی.

٦- بەڕێز کاك فایەق حاجی محەممەدی کوڵەك لە سلێمانی.

ئەم بەڕێزانەش بە دیوانی دەستنووس یارمەتی یان دام:

١-بەڕێز عەلی بەگی حسیەن بەگی جاف کەشکۆڵەکەی کەریم بەگی فەتاح بەگی جافی دامێ و لێی بەهرەوەر بووم.

٢-بەڕێز مەلا عەلی مەلا فەرەجی هەڵە بجەیی.

٣-لەبەڕێز کاك غەریب زێوەر (ئەصڵ و ڕۆح) مکەی پیرە مێردم لێی وەرگرت، زۆر هانی دام بۆ بەردەوام بوونم لەسەر تەواوکردنی ئەم دیوانە.

٤-شێخ ئەنوەری شێخ صدیقی نێرگسەجاڕی دیوانەکەی مەلا فەتاحی (کاگرد لی) ی دامێ.

٥-کاك ڕەئۆوف عەسمان مەعرووف دەستنووسێکی ئەجمەدین مەلای لادانم.

٦- شاعیری بەڕێزمان ع. ع شەونم کە دیوانێکی دەست نووسی مەولەوی دامێ کەلەسەرەتای سی یەکاندا لەهەورامی یەوە گۆڕابوو بۆ سۆرانی.

٧-مەلا کەریمی مەریوانی دیوانێکی دەستنووسی کۆنی دامێ:

زنجیرەی سوپاسەکەم بە ناوهێنانی خوشکە شوکریە حەمە ئەورەحمان کۆتایی پێ ئەهێنم، لە قوڵایی دڵ و ناخی هەستمەوە سوپاس و ستایشی بێ پایانی ئەم خوشکە ئەکەم، بەڕاستی زیاد لە پێویست و ئەو فەرمانانەی کەخرابوونە ئەستۆیەوە هەوڵی داو خۆی ماندووکردو بەوپەڕی لێ بووردن و دڵسۆزی یەوە تێ کۆشاو ڕەنجی کێشا.

ڕەمزو هێمای پیتەکان:

( م ): ملا عبدالكريمى مدرس، خوای گەورە بۆمانی بهێڵێ.

( ف ): کەشکۆڵەکەی خوالێخۆشبوو مەلا فەتاحی ( کاگردەلی ).

( ك ): کەشکۆڵەکەی کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف.

( ع ): مەلا عەلی مەلا فەرەجی هەڵەبجەیی.

( پ ): حاجی تۆفیق پیرەمێرد دیوانی ( ئەصڵ و ڕۆح ).

( مەر ) : مەلا کەریمی مەریوانی.

( بامۆ ) مەلا محەممەدی بامۆکی.

تێبینی:

( ١ ) لەدەرەوەی عێراق هیچ کەس بۆی نی یە ئەم کتێبە لەچاپ بداو بلاوی بکاتەوە.

# دیوانی



کونکونبیّ لەشم بەم برینانە
ڕێی ئامشۆی دڵ بۆلای ئاسانە
من کە خەجاڵەت دێمە خزمەتت
جەهەنەم! هەرگیز نەچمە جەنەتت

# مەولەوی







1559

